

ناوی کتێب : گەڕانەوە لە هەڵدێر

نوسەر : خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕ : هێمن عوسمان

داڕشتنەوەی : بەهرە محمد، شیرین کەریم

تیراژ : (٢٠٠٠)دانە

نۆبەی چاپ : یەکەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٠٣٩)ی ساڵی ٢٠١٢ ی پێ دراوە

---

# گەڕانەوە لە هەڵدێر

نووسینی

خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕانی

هێمن عوسمان

چاپی یەکەم

١٤٣٣ك - ٢٠١٢ز

# پێشەکی

وەك لە کتێبە چاپکراوەکانی دیکەماندا هاتووە، ئەم هەوڵەش لە لەسەرەتادا گرنگترین کێشەکانی مرۆڤ، پاشانیش کێشەکانی کۆمەڵگا نیشاندەدات و ڕوونیان دەکاتەوە.

ئەو کێشانەی کە دەریخستوون بە نموونەکان، بەو ساتانەی کە تیایاندا ڕوویانداوە و، چیرۆکە ڕاستەقینەکان نیشان دەدات و چارەسەری زۆر باش پێشکەش دەکات.

چیرۆکە زیندووەکانی ژیان، لەگەڵ شتە پێچەوانەییەکانی مرۆڤ، کێشە دەروونییەکانی، ئاستەنگەکانی، مل نەدانەکانی، و بۆ هەموو ئەمانە پڕە لە ڕێگە چارە.

ئەم کۆششە پێکهێنانی پەیامە دیاریکراوەکانە، بۆ ئەو پرسیارانەی مێشکی داگیرکردوون، ئەو فرمێسکانەی دەڕژێن، ئەو گەشەسەندنانەی جۆش و خرۆش دەبەخشن، ئەو ڕێگایەی کە بۆ دەربازبوون دەدۆزرێتەوە لەکاتێکدا بەرەو خۆکوشتن دەچن .

بەخوێندنەوەی ئەم کتێبە هاتنە ناوەوەی ژیانێکی دیکەیە بۆ ژیانتان، دونیایەکی دیکەیە بۆ دونیاتان.

لەمانەش گرنگتر، چارەسەری ئەو نهێنییانەی نەتانتوانیوە بۆ کەسی بدرکێنن، ڕێگای دەرچوونی لەو تەنگەژانەی نەتانتوانییوە لەگەڵ کەسدا بەشداری پێبکەن، چارەسەری دەردەکانی قەیرانی دونیای دەروونتان و بەتایبەتی کێشەکانی دونیای خۆتان و ڕێگای دەرچوون فێر دەبن .

ئەگەر ڕزگار کردنی ئەو کەسانەی دەچنە کەندەلانەوە، گەڕانەوەی ئەو کەسانەی دڵتەنگن بەرەو ئاسوودەیی، تەواوبوونی بێ ئومێدی، ڕۆشنکردنەوەی تاریکیو، سەرلەنوێ سەوزکردنەوەی دڵەکان بۆ ئێوە گرنگە، ئەوا پێویستە ئەم کتێبە بخوێننەوە .

بۆ سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنی خۆتان، ڕێکخستنەوە و چاو خشاندنەوە بە ژیانتاندا، ئەوا خۆتان بخەنە باوەشی ئەم دەرخستانەوە، بوونی جیهانێکی پڕ لە ئاسوودەیی و خۆشبەختی ئاشکرا بکەن .

بەهیوای سودمەندبوون...

خالید ئێرتوغروڵ

# مەلەك فاتمە



مامۆستای بەڕێز:

دوای ئەوەی بینیم زۆرێك لە خوێنەران، بیرەوەرییە گرنگەکانی خۆیانیان نووسیوەتەوەو، بۆیان ناردوون. منیش بڕیارمدا بیرەوەری خۆم بنووسمەوە .

بیرەوەرییەکەی من زیاتر گێڕانەوەی خەونێکە. بەڵام چ خەونێك ... دڵنیام لەوەی، ئەم خەونەی کە زۆر کاری تێ کردووم و چەندین ڕۆژ لە ژێر کاریگەریدا ماومەتەوە، ئێوەش و خوێنەرانیش زۆر بەلاتانەوە سەیر دەبێت .

من لە شارۆچکەیەکی گەورەدا پێگەیشتووم. دەرچووی ناوەندیم. شوومکردووە و دایکی دوو کچم، سوپاس بۆ خوا ژیانێکی ئاسوودەمان هەیە .

هاوسەرەکەم، کتێبەکانتانی کڕی بوو. هەردووکمان خوێندماننەوە. لە سایەی کتێبەکانتانەوە بە پەیامەکانی نوور

ئاشـــنابووین. ســـوپاس بـــۆ خـــوا دەســـتمان کـــرد بـــە ئەنجامـــدانی پەرستشـــەکانمان و، بـــەردەوام هەوڵـــدەدەین ســـوود لـــە بابەتـــە ئیمانییەکان وەربگرین .

ژنێك بـە نـاوی "مەلـەك فاتمـە" زۆر ڕۆڵـی هـەبوو لـە هانـدانم بـۆ باڵاپۆشی و دەسـت کـردن بـە ئەنجامـدانی پەرستشـەکان. ئـەم ژنـە تەمەنی چەند ساڵێك لە من گەورەتربوو. دوو سێ ساڵێك پێش ئێستا هاوسـەرەکەی و کـوڕێکی لەدەسـت دابـوو، لەگـەڵ کچـێکیدا دەژیـا، ژنێکی داوێن پاکو سەرڕاست و دینداربوو .

مامۆستای نەخش و دروومانی شارۆچکەکەمان بـوو و، لـە هـەمان کاتدا وانەی ئیمانی و قورئانیی بە کچە لاوەکان دەوتەوە .

بەهـەر ڕێگایـەك بووایـە "مەلـەك فاتمـە" کتێبـەکانی ئێـوەی بـە کچەکان دەخوێندەوە .

"مەلەك فاتمە" ژنێکی ئەوەندە نیاز باش و ڕۆح پاك بوو کە هـیچ کەس هەڵەو، ڕووگرژیـی لێ نـەبینییوە یـاخود وتـەی لار و هەڵـەی لێ نەبیستووە. لە بنەڕەتدا لەبـەر ئـەم هۆیـەش بـوو نـاوی بـە "مەلـەك فاتمە" دەرکردبوو .

مامۆستای بەڕێز:

ئـەم "مەلـەك فاتمـە"یـەی کـە بـۆم باسـکردن تووشـی نەخۆشـی شـێرپەنجە بـوو گیـانی سـپارد. نەخۆشـکەوتن و، وەفـاتکردنی زۆر کەمی خاياند .

له شەوی جەژنی ڕەمەزاندا کۆچی دوایی کرد. خودا لێیخۆش بێت. له پاش کۆچی ئەو، هەموو شارۆچکەکە فرمێسکمان ڕشت. فریشتەی چاکەی شارۆچکەکەو، دۆستی هەمووان، خوشکە گەورە و مامۆستامان "دادە فاتمە" لێمان جیابۆوە .

من لەگەڵ دادە فاتمەدا نزیکییەکی تایبەتیم هەبوو. خانووەکانمان زۆر لە یەکترییەوە نزیک بوون. زۆر گرنگی بە من دەدا. ئەو منی فێری نوێژ کردن و قورئان خوێندنەوە کرد. لەبەرئەوە، بۆ وەفاتی دادە فاتمە زۆر خەمبار بووم و زۆر گریام .

هەر لە پاش وەفات کردنی شەوێك لە خەوندا بینیم .

ئەو شەوە کەمێك درەنگ نوێژی خەوتنانم کرد. دادە فاتمە دیسان هەر لە مێشك و خەیاڵمدا بوو. ڕاستتر بڵێم هیچ لە مێشکم دەرنەدەچوو .

لە خەونمدا، لە کەناری ڕووبارە بچوکەکەی بەردەم شارۆچکەکەماندا بووین. ئەوێ شوێنێکە پڕە لە دار و سەوزایی. سەیر دەکەم دادە فاتمەش لەوێیەو ١٠ – ١٥ کەس لە دەوری کۆبوونەتەوە. هەمووشیان ئافرەتن. بەڵام ئافرەتانێکی پاك و نوورانیو، ڕووخسار درەوشاوە. خۆیشی سەرپۆشێکی سپی پۆشیبوو، ئەو کاتێك لە ژیاندا بوو بەردەوام سەرپۆشی سپی دەپۆشی. بە ڕاکردن چووم بۆلای وتم: "دادە فاتمە، من زۆر خەمبار بووم بۆت، زۆر گریام " .

لە باوەشی گرتم .

ژنێکی زۆر بە بەزەیی و میهرەبـان بـوو. هـەموو کـات ئامۆژگـاری دەکردم و، وەك دایکێك سۆزو میهرەبانی بۆ دەردەبڕیم.

وتی: "خۆشەویستم،" بۆچی ئەوەندە خەفەتت خوارد؟! نابیّ لە دوای کەسی کۆچکردوو خەفەت بخۆیـت و بگریـت. پێویسـتە دوعـای بۆ بکەیت".

وتم: " دادە فاتمە ئێستا چۆنی ؟"

- زۆر باشـم ڕۆڵەکـەم، سـەیرکە ئەوانـەش هاوڕێکـانمن. کەسـانی کردەوە باشی دونیا لە گۆڕدا سەربەستن. لەگەڵ هاوڕێکانیاندا یەکتر دەبینن. ئەمڕۆش هاتین بـۆ شارۆچـکەکەی ئێمـە. تـۆ یەکـەم کـەس بوویت کە سەردانت کردین.

دادە فاتمە پرسی: "نازدارەکەم چۆنە؟"

ئەو نازدارەی کە هەواڵی پرسی، کچی بوو. کچـێکی تـەمـەن ١٤ – ١٥ ساڵانی لە ژیاندا مابوو. لەگەڵ پوریدا بەیەکەوە دەژیان.

وتم: "زۆر باشە، هەموو ڕۆژێك یـەکتر دەبیـنین. زوو زوو دێـت بـۆ لامان".

- ئامـمـان بـە نازدارەکـەم بڵـێ واز لـە پەرستشـەکانی نـەهێنێت. غەیبـەت نـەکات، زۆر ئاگـاداری خـواردن و، خواردنـەوەی بێـت. درۆ نـەکات و بوختـان هەڵنەبەسـتێت. ڕۆڵەکـەم لەبەرئـەوەی لـە گـۆڕدا زۆرترین لێپرسینەوە لەبارەی ئەمانەوە دەبێت .

وەك ئــەوەی بمــەوێت وتــەكانی دادە فاتمــە لەبەربكــەم، لــە خەوەكەمدا دووبارەم دەكردەوە:

١- واز لە پەرستشەكانی نەهێنێت.

٢- غەیبەت نەكات.

٣- ئاگاداری خواردن و خواردنەوەی بێت.

٤- درۆ نەكات.

٥- بوختان هەڵنەبەستێت.

بابەتی مردن و گۆڕ، لەو شتانەبوون كە من بەردەوام گرنگیم پێدەدان، لێیان دەترسام و خەمم بوو. گۆڕستان بۆ من هەمیشە وەك شوێنێكی تەم و مژاویی، ڕاچڵەكێنەر، كەمێكیش ترسێنەر وابوو. لەبەر ئەم خەمەم، لە دادە فاتمەم پرسی: "لە گۆڕدا زۆر ترسایت؟"

وتی: "نەخێر ڕۆڵەكەم، چۆن دەبێت لە گۆڕ بترسین؟ گۆڕ دەرگایەكە، پیایدا تێپەڕدەبین بۆ دونیای نوێمان. بەڵام لە گۆڕدا زۆر پرسیاری قورس ڕووبەڕووت دەكرێنەوە. ئەگەر مرۆڤەكان، لە لێپرسینەوەی گۆڕ تێبگەیشتنایە و لە بیریان بووایە، ئەوا بە ترس و لەرزەوە هەنگاویان دەنا، چونكە لەسەر هەر هەنگاوێك كە دەینێن و هەر كردەوەیەك كە ئەنجامی دەدەن لێیان دەپرسنەوە".

پرسیم: ئایا " لێپرسینەوەی گۆڕ، زۆر قورسە؟"

وتی: "زۆر قورسە کچم، بەڵام ئەوانەی بە تەواوی بەندەی خودان و مافی خەڵکییان لەسەر نییە، زوو ڕزگاریان دەبێت. با مافی کەست لەسەر نەمێنێت. هیچ پەرستشێکت دوا مەخە. ئەگینا گۆڕ دەبێت بە شوێنی سزا".

هەر لەم گفتوگۆیەدا بووم لە خەونەکەمدا، ئەوەندەی پێ نەچوو بەخەبەر هاتم. بەرزبوومەوە، هەستامە سەر پێ. پەنا بە خوا، تەنانەت خەون بینین بە مردن و سزای ناو گۆڕەوە بەئەستەم بەرگەی دەگیرێت...ئەگەر ئافرەتێکی فریشتە ئاسای وەك دادە فاتمە، باشی باشەکان، کەسێك کە هەموو تەمەنی بۆ خزمەتی ئیمان و قورئان تەرخانکردبوو، لێپرسینەوەی گۆڕ بە زۆر قورس وەسف بکات، ئەی ئێمە چی؟ باشە بەم حاڵەمانەوە چیمان لێدێت؟

هەر چۆنێك بێت، زوو یا درەنگ، بەو ڕاستییە دەگەین و دەبێت بزانین چۆن وەڵامی لێپرسینەوەی ناو ئەو گۆڕە بدەینەوە کە تێی دەچین؟ یاخود چی دەکەین بۆئەوەی ئەو لێپرسینەوەیە بە ئاسانی بەسەرماندا تێبپەڕێت؟ ئامۆژگارییەکانی دادە فاتمە زۆر سەرنج ڕاکێش بوون.ئەم ئامۆژگارییانە، مایەی ڕزگاربوونن لە سزای گۆڕ، بەڵکو ڕێگاکانی بەدەستهێنانی بەهەشتی بەرینن.

هەرچۆنێك بێت ئەو گۆڕەی باوەڕمان پێیەتی ڕۆژێك تێی دەچین، هەڵبەت چارەیەکی ترمان نیە.

خوشکتان، سێڤدا تێکین

# کورم خەفەت مەخۆ
# ڕۆژێك دەبیتە مامۆستا



هـەموو دونیـا لای مـن، ئـەو شارۆچـکەیە بـوو کـە تیایـدا لـەدایك بووبووم. وامدەزانی مرۆڤەکانی ئەو شارۆچکەیەو، شاخو، دارستان و کانیاوەکانی ... بریتیین لە هەموو دونیا .

بۆ کێشانی سنوورەکانی ئەم دونیا بچووکەم، لـە خـەیاڵی خۆمـدا دەستمکردبوو بە بەراوردکردنی گەورەترین لوتکـە شـاخی دونیـا بـە بچـوکترین شـاخی شارۆچـکەکەو، دەریـا و ڕووبارەکـانی دونیـا بـەو کانیاوانەی شارۆچەکەکەمان کە لە هاویندا کەمیان دەکردو، هەرچـی دارستانەکانی دونیاشە بە دار تووەکـانی شارۆچـکەکەمان و، هـەموو خەڵکی سەرزەویش بە دانیشتوانی گوندەکـەمان کـە نزیکـەی هـەزار کـەس دەبـوون.هـەتا خوێنـدنی قۆنـاغی سەرەتاییشـم تـەواوکرد، نەچـووبوومە قـەزا و پارێزگاکـەمان. نەمـدیبوو شـار چـۆن شـوێنێکە تەنها بە خەیاڵ هەوڵم دەدا پێشبینی شار بکەم کە چۆن شوێنێکە.

هاورێکانم کاتێ دەیانوت:

- چووین بۆ شار، لە بازاڕدا گەڕاین، شیرینی و بەستەنیمان خوارد. پاشان بە پاص گەڕاینەوە.

بە سەرسامییەوە گوێم لە باسەکانیان دەگرت.

ئاخۆ دەبێ شار چۆن شوێنێك بێت؟ ئاه، یەکجار بمتوانیایە بچوومایە و بمدیبایە. توانای ماددیمان کەم بوو، کێشەی ئابووریمان زۆربوو. نەماندەتوانی وەکو پێویست سەردانی شارەکان بکەین و بگەڕێین.

دوو ساڵ بوو خوێندنی قۆناغی سەرەتاییم تەواو کردبوو. لەبەرئەوەی باری ئابووریمان لاوازبوو نەمتوانی درێژە بە خوێندنی قۆناغی ناوەندی بدەم.

لە بەیانییەوە تا ئێوارە لە دەشت و دەر، بە شوێن گا و مانگاوە بووم، ئێوارانیش هیلاك و ماندوو دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە.

کاتێ هاورێکانم دەبینی دەچوون بۆ خوێندنگە، زۆر پەرێشان دەبووم کە منیش ناتوانم درێژە بە خوێندن بدەم، حەزم نەدەکرد ڕووبەڕوویان ببمەوە، ئیرەیم پێ دەبردن، چونکە حەزم دەکرد وەکو ئەوان لەسەر خوێندن بەردەوام بم.

کاتێ بەدوای گا و مانگاکاندا دەڕۆیشتم، ناخۆشی خۆمم بۆ دارو بەردی سەرەڕێ باس دەکرد، قسەم لەگەڵ دەکردن و باسی حاڵ و

گوزەرانی خۆمم بۆ دەکردن. هەندێ جاریش دەبوومە مامۆستا و قسەم بۆ دەکردن.

لەبەرئەوەی نەمدەتوانی درێژە بە خوێندن بدەم زۆر بێزارو ناڕەحەت بووم بەجۆرێ کە هەندێ جار دەموت:

– خوایە گیان، چی دەبێت، قۆلێکم، چاوێکم، تەنانەت قاچێکیشم نەبێت، بەس تەنها بتوانم بخوێنم.

بە تێپەڕبوونی ئەو ڕۆژانەی کە نەمدەتوانی بخوێنم لە ناخەوە تووشی داڕمان بووم، زۆر خەفەتم دەخوارد، بەو هۆیەشەوە نەخۆش کەوتم. هاوڕێیەکم بردمی بۆ لای پزیشکی شارەکە. کە دەڵێین شار، واتە، قەزاکەمان.

– ئای ئەو شارە چەندە گەورە و دڵڕفێن بوو.

بینای گەورە گەورە، دوکانی ڕازاوە، ئۆتۆمبێلی هەمەجۆر، شەربەتو شیرینی و، ئەو منداڵانەی بەستەنییان دەفرۆشت... خەڵکی شار پانتۆڵەکانیان ئوتوکراو و بۆینباخیان بەستبوو... چ دونیایەك بوو، تێر نەدەبووم لە سەیرکردن و خەیاڵ بینین پێیانەوە .

ئەو پزیشکەی پشکنینی بۆ دەکردم پرسی:

کوڕم، خەفەت بەچی دەخۆیت؟ چی نیگەرانی کردوویت..

ئەو دڵە بچوکەم وەك باڵندە لە شەقەی دا، چاوەکانم هۆن هۆن فرمێسکیان پێدا هاتەخوار.

کاتێـك کـە نـەیتوانی لـە منـەوە وەڵامـی دەسـتبکەوێت، لـە هاوڕێکەمی پرسی. هاوڕێکەم وتی:

– دکتۆری بەڕێز، ئەم کوڕە زۆر حـەزی لـە خوێندنـە، هاوڕێکـانی چـوونەتە قۆنـاغی ناوەنـدیی، بـەڵام ئـەم نـەیتوانی لەسـەر خوێنـدن بەردەوام بێت و بچێتە ئەو قۆناغە. خەفەت بۆ ئەوە دەخوات.

پزیشـکەکە بـە میهرەبانییـەکی زۆرەوە لـە جێگاکـەی هەسـتا، دەستی بە سەرمدا هێنـا و، باوەشـی پێـدا کـردم و، ئـاهێکی قـووڵی هەڵکێشاو وتی:

– کەواتـە وایـە، هـا، تـۆ دەتویسـت بخوێنیـت، بـەڵام نـەتتوانی، لەبەرئەوە خەفەتت خوارد و نەخۆش کەوتیت.

بە چاوە فرمێسکاوییەکانمەوە ڕووم کردە ئەو پزیشکە میهرەبانـە و بەدەم گریانەوە وتم:

– بەڵێ.

– وتی: ئای خودایە، منداڵی خەڵکی حەز دەکات بخوێنێت، بەڵام لەبـەر بـێ دەرامـەتی ناتوانێـت و، خەفـەت دەخـوات و نـەخۆش دەکەوێت، منداڵی ئێمەش لە نـاو نازونیعمەتدایـە، واز لـە قوتابخانـە دەهێنێت و ڕادەکات. خوای گەورە هەر بەندەیـەکی بـەجۆرێك تـاقی دەکاتەوە. پزیشکە تەمەن ناوەندەکە گەڕایەوە بۆ لام و وتی:

– کـوڕم، مـن بـڕوام بـە دەسـەڵات و دادپـەروەری خـودا هەیـە. بێگومان بەندەکانی دەخاتە شوێنی شیاو .

لەبەرئەوەی تۆ ئەوەندە حەز دەکەیت بخوێنیت، هیچ خەفەت مەخۆ، هەر دەخوێنیت .

دووبارە لێم نزیك بوویەوە وتی:

– ئەگەر بخوێنیت حەز دەکەیت ببیت بەچی .

وەك ئەوەی بڵێی هەرئێستا داخوازییەکەم جێبەجێ دەکەن.

هاوارم کرد و وتم:

– مامۆستا.

پزیشکەکە زۆر گرنگی پێدام.

هاورێکەم وتی:

– دکتۆری بەرێز، زۆر سەرقاڵمان کردیت. ئیتر بە یارمەتیت ئێمە دەرۆین .

پزیشکەکە قۆڵمی گرت و وتی:

– نەخێر، من ئەم کورەم زۆر خۆش دەوێت. ئێستاش کاتی نیوەڕۆ هاتووە. دەی با بەیەکەوە دەرچین. ئەم کورە بەو قوتابخانەیەی بەرامبەرماندا دەگێڕین و نانیش دەخۆین. پاشان برۆن .

بەیەکەوە چووینە دەرەوە. ڕۆیشتین بۆ قوتابخانەیەکی نزیك کلینکی پزیشکییەکە. بەناو هەموو بەشەکانی قوتابخانەکەدا گەڕاین و، لەگەڵ مامۆستاکانی ئەوێدا بە یەکتری ناساندین، داخوازییەکەی منیشی بۆ بەڕێوەبەری قوتابخانەکە باس کرد .

ئەو قوتابخانەیەو مامۆستاكان لەبەرچاوم یەكجار مەزن بوون، بەجۆرێك كە تەواو سەراسیمەیان كردبووم، بە بینینیان خەفەت و بێتاقەتیم زیاتر بوو.

ئەو مامۆستا رێك پۆش و، چاویلكە لە چاوانە بە تەواوی دونیا بچووكەكەی منیان هەژاندبوو. شكۆمەندی و جوانی ئەو قوتابخانەیە بووبووە جێگەی سەرنج و تێرامان. لەڕاستیدا ئەم دیمەنانە وەكو كڵپەی خۆشەویستی ناخی منیان دەسوتاند، بەجۆرێك كە ناتوانم گوزارشتیان لێ بكەم.

لە ناخمدا دەپاڕامەوە:

– خوایە گیان چی دەبێت، منیش ببم بە مامۆستایەكی ئاوەها بۆ قوتابخانەیەكی لەم شێوەیە .

بەڕێوەبەری قوتابخانەكە خواردنەوەیەكی گەرمی پێشكەش كردم. هەروەها بۆ ورەپێدانیش وتی:

تۆ منداڵێكی زۆر بە توانای. ئادەی با بتبینم. بەهەر شێوەیەك بێت دەخوێنیت و دەبیتە كەسێكی خوێندەوارو پێگەیشتوو.

إن شاء الله !...

پزیشكە بەڕێزەكە، من و هاوڕێكەمی برد بۆ چێشتخانە.

خواردنە هەمە جۆرەكان، ڕیز ڕیز ڕێكخران. كەوچكەكان تەختە نەبوون، كانزابوون. مێزەكان ئامادەكراو و ڕێك وپێك بوون .

جارێکیان نانی ئەو شارەی بەرامبەرمانیان هێنا. من زۆر کەم نانی شارم بینیبوو. هیچ نەبێ بۆ تەنها جارێك بە ڕاستی خواردنی شارم لە نێوان نانی ناسکدا دانا و خواردم. ئێستا زۆرێك لەو نانەیان لەبەر دەممدا دانا .

پزیشکە بەڕێزەکە چەناگەی گرتم و، سەری بەرزکردمەوە بۆ لای ڕووە دەمبەخەندەکەی .

– ئادەی بڵێ بزانم چیت دەوێت، با شاگردەکە بیهێنێت.

ئایا لە شەرما و لە شەرمەزاریدا دەنگ دەردێت؟!

مێزێکی گەورەیان بە خواردن ڕازاندەوە، بە بینینی شڵەژام، لەنێو هەموو ئەو خواردنانەدا تەنها پلاو و زەلاتەکەیم دەناسی. پێشتر سوراحیی و پەرداخی لەو شێوەیەم نەبینیبوو.

نەمدەزانی لە کوێوە دەست پێبکەم. لە لایەك نانم دەخواردو، لە لایەکیشەوە خەمی ئەوەم بوو کە دەبێت دووبارە بگەڕێمەوە بۆ شارۆچکەکەو جارێکی تر ئەم جوانییانە نەبینمەوە .

پزیشکەکە دەرمانەکانی بۆ کڕیم و سەبارەت بە تەندروستیم ڕێنمایی کردم و، دەربارەی داهاتووم ئامۆژگاری کردم. هەروەها سەرەڕای ئەوەی پارەی پشکنینەکەی لێوەرنەگرتم پارەی پێدام بۆ خەرجیم .

زۆر دڵخۆشی کردم و هانی دام. وەك بڵێی دونیام ڕووخابوو، تەواوبووبوو. ئەو سەرلەنوێ ژیاندییەوەو، پڕی کرد لە ئومێد.

سێ ساڵ دوای تەواوکردنی خوێندنی قۆناغی سەرەتایی، نەمتوانی لە خوێندنی قۆناغی ناوەندیی بەردەوامبم. بەڵام خوای باڵادەست، دوعای بەکوڵی بەندەکانی ناگێڕێتەوەو، دەرگاکانی بەزەیی بەڕوویاندا داناخات و هەل و دەرفەتی جۆراوجۆریان بۆ دەڕەخسێنێت.

لە کۆتاییدا پیشەی مامۆستایی بووبە قسمەتم، ئەو پیشەیەی کە زۆر لەخوا دەپاڕامەوە بیکات بە نسیبم و، بەردەوام لە خەیاڵمدا بوو.

لە سێهەمین ساڵی دەستبەکاربوونمدا وەك مامۆستا، ئەوەی کە لە بیرمدا نەبوو، دامەزراندنم بوو لە قەزاکەی خۆم .

تەماشای گەورەیی‌و میهرەبانی بێ کۆتایی ئەو خودایە بکەن، ئەو قوتابخانەیەی کە دامەزراندنەکەمی بۆ دەرچووبوو، هەمان ئەو قوتابخانەیەبوو کە پزیشکەکە بردمی. بەڵێ، لەو قوتابخانەیەی کە بەڕێوەبەرەکەی خواردنەوە گەرمەکەی پێشکەش کردم، زۆرێك لە مامۆستاکانی تا ئەو کاتە لەوێ مابوون.

کە لە دەرگاکە چوومە ژوورەوە نەمتوانی خۆم بەرامبەر بە دەسەڵات و بەزەیی خوای پەروەردگار ڕابگرم، دەستم کرد بە گریان. دوای چەند ساڵێك، بووم بە بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەیەی کە چەندین ساڵ خەونم بەوەوە دەبینی کە تیایدا ببم بە مامۆستا،

خوداى بالآدەست هەنگاوێك زياتر بەرەوپێشى بردم و، بووم بە بەڕێوەبەر .

ئاخر مرۆڤ چۆن دەتوانێت لە حزوورى ئەو هەموو شكۆمەندى و بەخشينە بێ سنوورەى خواى گەورەدا چۆك دانەدات و نەگرى؟ چۆن دەتوانێ سوپاسى ئەو پەروەردگارە مەزن و دانايە نەكات.

ئەو پزيشكەى كە ڕێنمايى كردم و هانى دام كۆلێژى دوايى كردبوو، چارەنووسى يەكتر بينين نەبوو، بەلآم بەردەوام لە پاڕانەوەكانمدا يادى ئەو مرۆڤە گەورەيە دەكەمەوە.

خوداى بالآدەست هەم بۆ ئەم نيعمەتانە و هەميش بۆ ئەم ئەركە پيرۆزە شايستەمان بكات.

# دەچمە بووكێنی

حەلیمە خان، تەمەنی زۆر بچوك بوو كە باوكی كۆچی دوایی كرد. لەگەڵ دایكیدا كەوتبوونە ژیانێكی سەختەوە، بە تەنها مابوونەوە، پارێزگارییان لە خۆیان دەكرد، كەسێكیان نەبوو چاودێریان بكات. تەنها بەختیان ئەوەبوو كە لە گوندێكی بچوك و ئارام و جێ متمانەدا لە نێوان دۆستەكانیاندا بوون.

حەلیمە خان، لەبەر دابینكردنی بژێوی خۆی و دایكە ئیفلیجەكەی، دوای خوێندنی قۆناغی سەرەتایی خۆی فێری دروومان و نەخش كردبوو. بۆ پەیداكردنی پارە تا ئێوارە لەماڵەوە خەریكی جلدورین بوو.

كاتێك كە گەنج بوو، خوازبێنی كارانی نەدەویست و پەسەندی نەدەكردن. دەیوت: دایكم بە تەنها دەمێنێتەوە. پاشانیش تەمەنی چووە پێش و تووشی نەخۆشییەكی ترسناك بوو. بەم شێوەیە

هاتبووه سەر ئەو باوەڕەی کە ئەو جیهازییەی ئامادەیکردبوو لەگەڵ ئەو جلی بوکێنییەی کە بە وردی دوریبووی ئیتر مانایەکیان نەماوە.

زۆر نەخۆش بوو، هەستی بە ساردی هەناسەی مردنی دەکرد. دایکە پیر و ئیفلیجەکەشی زۆر خەفەتی بۆ بارودۆخی کچەکەی دەخواردو، بەدرێژایی ڕۆژ لە ماڵەوە فرمێسکی دەڕشت.

لەلایەك کێشەی ماددی و تەنهاییو، لەلایەکی دیکەشەوە دارمانی خەیاڵەکانی کچێنی و هەنگاونان بەرەو مردن، حەلیمەیان پەرێشانکردبوو.

لەو ڕۆژانەدا مامانێك هات بۆ گوندەکە. لەگەڵ ئەوەی گوندنشینبوو خانمێکی وریا و زانا و ئیماندار بوو، زۆر بەخێرایی لەگەڵ بەرامبەرەکەی پێکدەهات .

مامانە بەڕێزەکە بیستی کە حەلیمە نەخۆش کەوتووە، سەردانی کردو، کاتێك کە حەلیمەی بینی بەدەست نەخۆشییەکی قورسەوە دەناڵێنێ، خزمایەتی و بەزەیی نیشانداو، دڵنەوایی کرد و گرنگی پێ دا.

کتێبی پەیامی بیمارانی دا بە حەلیمەو. هەموو ڕۆژێك سەردانی دەکرد و بەشێك لەو کتێبەی بۆ دەخوێندەوە، دڵی حەلیمەی پڕکردبوو لە بابەتەکانی ژیانی کاتیی و گرنگی بەندایەتی و ئامادەکاری بۆ ڕۆژی دوایی و شکۆمەندی بەهەشت، میهر و بەزەیی پەروەردگار و دونیای هەتا هەتایی.

هـەموو ئـەو باسـانە سـەبارەت بـە حەقیقـەتی ڕۆژی دوایـی و هەمیشەیی لەدوای مردن ئەوەنـدەی تـر مردنیـان لای حەلیمـە خـان خۆشەویست کردبوو، چونکە مردن حەلیمە لە کێشەکانی ئـەم دونیـا کاتییە ڕزگار دەکات و، هۆکارێکە یاخود بلیتی ڕێبوارێکە بۆ گەیشتن بە ڕۆژی دوایی بە ئارامیی و ئاسوودەیی.

ئـەو ڕۆژەش لەگـەڵ مامانـە بەڕێزەکـەدا پـەیامی بیمارانیـان دەخوێندەوە.

ئەگەر ئەم دونیایە بەردەوام بووایە و مردن لە ڕێگەماندا نەبوایە. ئەگەر ڕەشەبای جیابوونەوە و لەناوچوون هـەڵی نەکردایـە، گـەر لـە داهـاتوودا وەرزە مەعنەوییـەکانی زسـتان نەگبـەتی و گـەردەلوول نەبووایە. منیش لەگەڵ تۆدا بەزەییم بە حاڵتا دەهاتەوە. بەڵام مادام ڕۆژێك لە ڕۆژان دونیا پێمان دەڵێت دەی بۆ دەرەوە، گوێی لە هـاوار و زریکەمان دادەخات. پێش ئـەوەی بمانکاتـە دەرەوە، بـا ئێمـە بـە وریاکردنەوەی ئەم نەخۆشییانە، لـە ئێسـتاوە واز لـە خۆشەویسـتی ئەو بهێنین. پێش ئەوەی ئەو ئێمە بەجێبهێڵێت، پێویستە لـە دڵـەوە هەوڵ بدەین بەجێیبهێڵین. بەڵێ نەخۆشیی بـەو واتایـەی کـە بیرمـان دەخاتەوە، دەڵێت: " لاشەت لە بـەرد و ئاسـن نییـە، لـە ماددەیـەك پێکهاتووە کە بەردەوام ئامادەی جیابوونەوەیە. واز لە نەفس بەرزی بهێنە، لـە بـێ دەسـەڵاتیت تێبگـە. خاوەنەکـەی دەستنیشـان بکـە، ئەرکەکەت بزانە، فێرببە کە بۆچی هاتویتە دونیاوە".

نەخۆشـی وەك صـابوون، چـڵكی تاوانـەكانتان پاكدەكاتـەوە و، خاوێنیـان دەكاتـەوە، نەخۆشـییەكان كـەفارەتی تاوانـەكانن. لـە فـەرموودەی صـەحیحدا هـاتووە؛ وەك چـۆن بـە ڕاوەشـاندنی درەختێكـی بـاش میوەكـانی دەكەونـە خـوارەوە، لـەرزینی نەخۆشییەكی بەئیمانیش تاوانەكانی بەو شێوەیە هەڵدەوەرێنێ.

"... ئەوەی خوای گەورە ناناسێت، ژیانی پڕە لە بەڵا، ئەوەیشی خوای گەورە دەناسێت ژیانی پڕە لە نوور" (بەدیعوززەمان)

هـەموو ڕۆژێـك لەگـەڵ مامانـە بەڕێزەكـەدا بەیەكـەوە ئـەم ڕاستییانەیان دەخوێندەوە. كە دونیای حەلیمەیان پڕكردبوو لە نوور و شادی وتبووی:

- دایكە ئیتر لە مردن ناترسم. لە دایكبوون نیعمـەتێكی خودایـە، هەروەها مردنیش ... مادام لـە خـوداوە دێت بۆچـی بترسـم. خـوای پـەروەردگار هـەرگیز زوڵـم لـە بەندەیـەك ناكـات كـە پـەروەردگاری دەناسـێت و پـەنای بـۆ دەبـات، بـەڵكو بـە بـەزەیی و سـۆزەوە هەڵسوكەوتی لەگەڵ دەكات.

حەلیمە خـان سـەرەڕای ئـەو نەخۆشـیە قورسـەیشـی، نوێـژەكانی لەسـەر جێگـای نەخۆشـییەكەی دەكـردو، بـەردەوام خـەریكی خوێندنەوەی قورئان و تەفسیری قورئان بوو. ڕۆژێكی دیكـە مامانـە بەڕێزەكە هاتەوە لای. ئەو ڕۆژە حەلیمە لە خۆشی و ئاسوودەییەكی

تردا بوو. وەك ئەوەی هەموو ئامادەكارییەكی كردبێت، چاوەڕێی میوانێكی دەكرد.

سندوقێكی نیشانی مامانە بەڕێزەكەداو وتی:

- دادە ئەو سندوقە بكەرەوە.

مامانە بەڕێزەكە پرسی:

- چی دەكەیت كچم.

كە حەلیمە پێداگری كرد، كەمێك بە جددی وەریگرت. مامانە بەڕێزەكە ئەو سندوقە دەستكردەی حەلیمەی كردەوە. كە زەحمەت و ئومێد و چاوەڕوانی چەندین ساڵەی كچێكی گەنجی تیادا شاردرابۆوە.

مامانە بەڕێزەكە بە دڵتەنگییەوە دەستیكرد بە تەماشاكردنی سندوقەكە. چاوەكانی بڕیبووە ئەو جیهازیانەی كە نەگەیشتبوونە مەبەست، دەبێت بە چ خەیاڵێكەوە ئەمانەی دروستكردبن! .

- وتی: دادە، ئەو جلە بوكێنییانەی ئەویا دەربهێنە و بۆم بهێنە.

مامانە بەڕێزەكە نەیتوانی لەوە تێبگات كە حەلیمە دەیەوێت چی بكات.

جلی بوكێنییەكەی دەرهێنا. حەلیمە بە وردی جلی بوكێنییەكەی لەبەركرد. دەستنوێژی تازەكردەوە. قورئانی پیرۆزی گرتە دەستی و سورەتی یاسینی كردەوە. ڕووی كردە دایكی و مامانە بەڕێزەكە كە بە سەرسوڕمانەوە سەیریان دەكرد وتی:

– ئـیتر مــن ڕێبـوارم. مــن بــه ئیمــان و بــه قورئــان و جلـه بوکێنییەکانمەوە دەچمە بەردەم خـوای پـەروەردگار. لـە خەونمـدا وایان پێ وتم.

مامانە بەڕێزەکە بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

– کێ وتی؟ لە خەونتدا کێت بینی؟

حەلیمە خان چاوەکانی گەش داگیرسان و لە دەرگاکەی دەڕوانی.

– ئەوەتا دادە، ئەو خانمەیە کە دێت...

مامانە بەڕێزەکـە و دایکـی حەلیمـە لـە یـەك کاتـدا ڕوویـان کـردە دەرگاکە. بەڵام نەیانتوانی هیچ ببینن .

مامانە بەڕێزەکە پێشبینی ساتەکانی کۆتایی ژیانی حەلیمەی کرد و تێگەیشت کە فریشتەی ڕۆح کێشان ئـەرکی خـۆی بەجێـدەهێنێت. بۆیە لە حەلیمە نزیك بووەوە.

حەلیمە وتی: تەماشـاکە دادە، ئـەم خانمـە دەناسـیت، هـەر ئـەو دادەیە بوو؟

مامانە بەڕێزەکە بێ دەنگ ببوو، تەماشای دەکرد.

حەلیمە بەردەوام بوو.

– ئەم خانمە من دەبات. با ئیمانمان نوێ بکەینەوە.

حەلیمـە خـان لێوەکـانی بـە هێواشـی کرانـەوەو، لـە ناخـەوە بـە قووڵی شەهادەتی هێنا. پاشانیش لەگەڵ ئەو فریشـتەیەی تەنیشـتی کۆچیکرد بۆ ئەو دونیا و، ڕۆیشت.

مامانە بەڕێزەکە و دایکی حەلیمە هیچ نەگریان. بە پێچەوانەوە پیرۆزباییان لە حەلیمە کرد. لەبەرئەوەی حەلیمە ڕۆیشت بۆ مەنزڵێکی هەمیشەیی و نەبڕاوە، لەبری ئەم دونیا کاتیی و چەندساڵییە، ژیانێکی هەتا هەتایی بردەوە. ئایا پێویست دەکات لەدوای کەسێکی لەم جۆرە بگرین؟

کاتێ ئەم بیرەوەرییەم لە مامانە بەڕێزەکەوە بیست، زۆر کاری تێکردم.

خوای پەروەردگار، ئیمان و قورئان بکەیتە قسەمەتی کۆتا هەناسەمان.

# شەرمەزارم مەکە

لەو ڕۆژەدا لە پۆلی چواری سەرەتایی بۆ پۆلی پێنج دەرچووبووم، لە خانەی تێبینییەکانی ئەو کارتەی وەرمگرت لە سەرەتا تا کۆتایی (زۆر باشە) نووسرابوو، ڕێگایماڵەوەم گرتەبەر، هەر دەڕۆیشتم و نەدەگەیشتم، لەخۆشیاندا چۆلەکە ئاسا دەفڕیم. ناخم پڕبووبوو لە خۆشی، وتەکانی مامۆستاکەمان و ستایشەکانی لە مێشکەمدا دەنگیان دەدایەوە.

مامۆستاکەمان پێی‌وتم کە باشترینی پۆلەکەمان بووم. خوایە گیان ئەمە چ هەستێکی خۆش بوو؟ وامدەزانی سەرم گەیشتۆتە ئاسمانەکان. هاتمە بەردەم ئەو باڵەخانەیەی ماڵەکەمانی لێبوو. دراوسێکانمان لەبەردەم دەرگای باڵەخانەکەدا کۆبووبوونەوە، بە دەنگێکی نامۆ هەواڵم پێدان، هەموویان لە بێدەنگییەکی قووڵدابوون. لەبەرئەوەی زۆر دڵخۆش بووم، زۆر لەسەر ئەمە نەوەستام و دەستمکرد بە سەرکەوتن بەسەر پلیکانەکاندا.

لەدڵی خۆمدا دەموت: پاش کەمێکی تر دەرگاکە دەکەمەوەو، دەڵێم:"دایکە، دایکە ئەوەتا کارتەکەم. سەیرکە، یەکەمی پۆلەکەم. لە هەموویان باشترم".

لەلایەکی دیکەشەوە باوکم بەڵێنی پێدابووم پاسکیلم بۆ بکڕێت... لەبەرئەوە لەبەرخۆمەوە دەموت: بە درێژایی وەرزی هاوین پۆز بەسەر هاوڕێکانمدا لێدەدەم و بەپاسکیلەوە بە بەردەمیاندا دێم و دەچم. کاتێ گەیشتمە ئەو قاتەی شوقەکەمانی لێبوو، دەنگی هاوار بەرزبوویەوە، ئەو خۆشییەی لە دڵمدا بوو لە یەك ساتتدا تەواوبوو، ترسێکی نەزانراو جێگای گرتەوە. شتی خراپ بە مێشکمدا دەهات. خەم و پەژارە دایگرتم...

ئەو خەمەی جار جار لەناخی دایکمدا سەری هەڵدەدا، ناخمی وروژاند .

باوکم فڕۆکەوان بوو، دایکیشم ئەوەندە ناڕەحەتی چەشتبوو بەدەست ئەم کارەوە. دەیوت: "پیاوەکە بەرگە ناگرم. بەدەست خۆم نییە؟ ئیتر واز بهێنە... پارووییەك نانی بێ ترس و مەراقمان دەرخوارد بدە، زۆر دەترسم".

باوکم مرۆڤێکی زۆر جوامێر و کامڵ بوو، هەموو جارێك دایکمی هێوردەکردەوە و دەیوت:"خوای پەروەردگار گیانێکی بە قەرز داوە بە هەموو کەسێك، ئەوانەی دەمرن تەنها فڕۆکەوانەکان نین. ئەوانەی لەسەر کورسی گەرمیش دادەنیشن هەر دەمرن. دە ئیتر ئەو ترسە

له مێشکت لاببه. ئه‌م پیشه‌یه ئه‌وه‌نده شه‌ره‌فمه‌ندانه‌یه، خوانه‌کا لێی جیاببمه‌وه، ئه‌گینا ده‌مرم".

باوکم ده‌یویست منیش ببم به فڕۆکه‌وان. بۆ ئه‌وه‌ی وام لێبکات حه‌ز له‌و ڕێبازه بکه‌م، به‌رده‌وام هه‌وڵی ده‌دا قایلم بکات. له‌به‌رئه‌وه هه‌ر له مندالّییه‌وه حه‌زم ده‌کرد ببم به فڕۆکه‌وان... به‌لّێ، بڕیارێکی خێرابوو بۆ ژیان، به‌لاّم ببومایه ده‌بووم به فڕۆکه‌وان. کاتێ دایکم ڕووبه‌ڕووم ده‌بووه‌وه، بۆئه‌وه‌ی تووڕه‌ی بکه‌م، هاوارم ده‌کردو ده‌موت: "یان ده‌بمه فڕۆکه‌وان یان ده‌مرم".

مردن ها؟ په‌نا به‌خوا ! ئه‌گینا!!؟

به‌زۆر خۆم فڕێ دایه مالّه‌وه...

به‌داخه‌وه، ترسه‌که‌ی دایکم به‌دیهاتبوو.. باوکم له مه‌راسیمێکی فڕۆکه‌وانیدا شه‌هید بووبوو.

ئیتر له‌و ڕۆژه به‌دواوه فڕۆکه‌وانی هێنده له‌پێش چاومدا مه‌زن بوو، که خولیای فڕۆکه‌وانی که‌وتبووه سه‌رم، به‌جۆرێك که هه‌موو هه‌سته‌کانمی کۆنترۆڵ کردبوو، بووبووه تیشکۆو ناوه‌ڕۆکی ژیانم.

ئیتر وه‌ك مندالّی باوکێکی شه‌هید، ئامانجم ته‌نها فڕۆکه‌وانی بوو. بۆ نیشتمانه‌که‌مان، بۆ ئاسووده‌ییمان... ئه‌م هه‌سته کاری کردبووه سه‌ر مێشکم و چووبووه خوێنمه‌وه .

له کۆتاییدا خوێندنی قۆناغی ناوه‌ندیم ته‌واو کرد، باری ئابووریمان زۆر لاواز بووبوو، نه‌مده‌توانی فریای ئاره‌زووی بوونه

فڕۆکەوانی بکەوم، پێویست بوو لە ڕێگایەکی کورتەوە دەستم بە ئیشێك بگات.

بە یارمەتی ئەفسەرێکی هاوڕێی نزیکی باوکی خوالێخۆشبووم چوومە قوتابخانەی ئامادەیی ئەفسەرییەوە، بە تەواوکردنی پەروەردەی تەکنیکی هەوایی بە سەرکەوتوویی، بوومە ئەفسەر، نەبوومە فڕۆکەوان، بەڵام کاتێك لەگەڵ فڕۆکەوانەکاندا بەیەکەوە دەفڕین، هەنگاوێك لەم ئارەزووەم نزیك دەبوومەوە .

ئیتر دەفڕیم، پیشەکەمم زۆر لا خۆشەویست بوو بەجۆرێك کە دەمویست هەموو شتێك لەبارەیەوە شارەزابیم. هەمیشە ئەو پرسیارە مێشکمی دەورووژاند کە: بۆچی دەبێت کەسانی تر تەکنەلۆجیا دابهێنن؟ ئایا ئێمە چ کەموکوڕییەکمان هەیە؟ هەرچۆنێك بێت منیش دەبێت لەو بوارەدا شتێك بکەم .

بەڵێ هەولم دەدا هەموو شتێك دەربارەی ئەو ئامێرانەو نۆژەنکردنەوەیان بزانم... ئەو ئارەزووانە چووبوونە ناو خوێنمەوە.

ماوەیەك تەکنیککاری فڕۆکەیەك بووم.. زۆر باش لە هۆکاری ئەوە تێگەیشتم کە بۆچی باوکم دەیویست ببمە فڕۆکەوان. ئەم ئالودەییە بە هیچ شتێك پێوانە ناکرێت، باوکم دەیوت:"تەنها مردن من دادەبڕێت لەم پیشەیە" ... ئای چەندە ڕاستی دەوت.

لەبەر ئەوەی لەو بوارەی خۆمدا سەرکەوتووبووم، ناردیانم بۆ ئەمریکا. زانیاری تەکنیکی ئەو هێلیکۆپتەرە نوێیانەمان وەردەگرت

که دەیاندا بە وڵاتەکەمان. بە جۆرێك خوم دابوویە ئەم ئامێرە نایابە کە، جار جارە بیرۆکەی وەك:"ئەوەیان زیاد بکردایە، ئەوەیان بەو شێوەیە بوایە" دەهات بە مێشکمدا، ئەو بیرۆکانەی کە لەو بارەیەوە پێشنیازم دەکردن، سەرنجی پسپۆرە ئەمریکاییەکانی ڕاکێشابوو.

ڕۆژێکیان ئەو کەسەی ئیشەکانمانی ڕێکدەخست بانگی کردم بۆ ژووری ئەفسەرێکی ئەمریکی، ئێوارە خوانێکیان بۆ ئامادە کردبووم .. لە پاشانیشدا داخوازییەکی زۆر سەیریان هەبوو.. وتیان: ئەگەر لەگەڵ ئێمەدا لە ئەمریکا ئیش بکەیت، ڤێلایەك، تازەترین مۆدێلی ئۆتۆمبێل... مانگانەش دە هەزار دۆلارت دەدەینێ ..

پاش هەفتەیەکیش وەڵامیان دەویستەوە.

بەڕاستی لەبەرامبەر ئەم داخوازییە گەورەیەدا سەرم دەخولایەوە. بۆ مرۆڤێکی ئاسایی وەك من... هێشتا ژیانی لە سەرەتادا بێتو دڵنیا بکرێت، بۆ نابێت؟ بە وردی بیرم لە داخوازییەکە کردەوە. وەڵامەکەم ئەرێ بوو، بەڵام پێویست بوو لەگەڵ دایکمدا ڕاوێژ بکەم. هەر واشم کرد...

زۆر بەسەرنجێکەوە بابەتەکەم بە دایکم ڕاگەیاندو، لایەنگری خۆشمم بۆ ئەم ئیشە خستەڕوو.

دایکم، زۆر بە ڕەقی وتی: "کوڕم،... تۆ شێت بوویت؟ چۆن بیرت دەچێت کە تۆ منداڵی کێیت؟ خوێنی کەسێکت هەڵگرتووە کە بۆ نیشتمانەکەی گیانی بەخشیووە. تۆش هەڵدەستیت دەست لەگەڵ بێگانەدا تێکەڵ دەکەیت ها؟ سەیرکە ڕۆڵەکەم، شەرم دەکەم دایکی

کەسێك بم کە بۆ خۆشیی ژیانی خۆی تێدەکۆشێ و، لە کاتی پێویستیدا گیان و خوێن و هەموو شتێکی نابەخشێت بە نیشتیمانەکەی. ڕۆڵەکەم، تکا دەکەم شەرمەزارم مەکە".

ئەم وەڵامە پڕ مانایەی دایکم منی ڕووخاند.

بەڵێ، ئەوەی ژیانی پێداوین بۆ ئەم نیشتیمانە، دەبێت لەکاتی پێویستدا ژیانی خۆمانی پێ بدەینەوە.

ئەمڕۆ، لە ئاهەنگی وڵاتەکەمدا بەخۆشحاڵییەکی زۆرەوە دەفرم، لەوانەیە هێندەی ئەمریکییەکان دۆلارم نەبێت، بەڵام خۆشەویستی خزمەتکردنی ئەم نیشتمانە و ئیمان و شانازیم هەیە. بە تێپەڕبوونی ڕۆژگاریش لەوە تێگەیشتم زۆر شت هەن کە لە پارە گرنگترن بۆ مرۆڤ.

* * *        * * *        * * *

لە پرسەی سەرهەنگێکی خانەنشینی دراوسێمان ئەم ئەفسەرەمان ناسی، زۆر کاری کردە سەر من و ئەوانەی ئامادەی ئەو پرسەیە بوون، وەك نموونەیەکی زیندووی نیشتمان پەروەری ڕاستەقینە، هەموومان شەیدای بووین.

# مامۆستاکەم

# ژیانی پێ بەخشیم



دوای تـــەواوکردنی خوێنـــدنی قۆنـــاغی ناوەنـــدیی، ســـوودم لـــە تاقیکردنـــەوەکانی خانـــەی پێگەیانـــدنی مامۆســـتایانی ســـەرەتایی ئێـــواران وەرگـــرت. دەرنەچـــوونم لـــە تاقیکردنـــەوەکانی خانـــەی پێگەیاندنی مامۆستایانی سـەرەتایی، دەبـووە خـاڵی گەڕانـەوە بۆ دواوە لە ژیانمدا. چەندین مـانگ بـوو کـە هـەموو سـەرنج و جۆش و خرۆش و، ئاواتەکانم لەم خاڵەدا چڕکردبووەوە.

نەمـدەتوانی ئـاواتی بـوونم بـە مامۆسـتای قۆنـاغی سـەرەتایی لەبیربکـەم، ئـەم داخوازییـەی مـن جیـابوو لـە داخـوازی هـەر خوێندکارێکی دیکـە، چـونکە خێزانەکـەمان کـەم دەرامـەت بـوو، لـە ڕێگەیەکی کورتەوە هەلپەی ئەوەم دەکرد کـە بـە ناچاری پشـت بـە دەوڵـەت ببەسـتم. لەبەرئـەوەی لـەو سـاڵانەدا دەوامـی خانـەی

پێگەیاندنی مامۆستایان ئێواران بوو، ئەو قوتابییانەی کە باری ئابوورییان لاواز بوو نەیاندەتوانی دەست بەرداری ببن.

هۆکاری دووەمی ئەوەی کە دەمویست ببمە مامۆستای قۆناغی سەرەتایی ئەوە بوو کە لە پاش خوێندنی قۆناغی سەرەتایی بە شەو و ڕۆژ بەم خەیاڵەوە دەژیام. هەموو پاڕانەوەو، ئومێدو، چاوەڕوانیەکانم لەسەر ئەمە بونیاد نابوو. جیا لەوەش، ئەگەر مامۆستایەتی قوتابخانەی سەرەتاییم بەدەستنەهێنایە زۆر باش دەمزانی کە لە داهاتوودا ناتوانم درێژە بە خوێندن بدەم. لەبەرئەوەی باری ماددیم بۆ خوێندنی قۆناغی ئامادەیی و پاشانیش زانکۆ گونجاو نەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ دایکی خوالێخۆشبوومدا بەیەکەوە خەیاڵی مامۆستایەتی سەرەتاییمان خستبوە مێشکمان، ئومێدەوارو چاوەڕوان بووین، بە کورتی، بوون بە مامۆستای سەرەتایی بۆ ژیانی من بووبووە بنەمای خەیاڵی بوون و نەبوون.

بە نەخشەی خۆم، ئامادەکاریم بۆ تاقیکردنەوەکانی خانەی مامۆستایان کرد. بەڵام کاتێك بیستم ساڵی ڕابوردوو لەو قوتابییانەی بەشداری تاقیکردنەوەکانیان کردبوو کە لە ٦٠٠ کەس زیاتر بوون تەنها ٢٠ کەسیان وەرگیراون، ئیتر ورەم ڕووخا.

کاتێك ئەوانەی دەوروپشتم دەیان وت ئومێدەوار مەبە، ئەوانەی پشتیان هەبێت دەچن و وەردەگیرێن. تەنانەت لە ئێستاوە دیارە کێ

وەردەگیرێت، یەك پارچە دەڕووخام و، ئومێدو خۆزگەكانم دەبوونە سەراب.

بۆ تاقیكردنەوەكە ئێمەیان بردە هۆڵی وەرزشی خانەی مامۆستایانەكەوە، قوتابییەكان هێندە زۆربوون، هۆڵەكەیان پڕ كرد. منیش كەوتمە دوایین ڕیزی پشتەوە.

لە ناو جۆش و خرۆش و ترسێكی زۆردا بووم، دەرچوون لە نێوان ئەو هەموو قوتابیەدا یەكجار زەحمەت بوو.

تاقیكردنەوە دەستیپێكرد. دە پرسیار هاتبوەوە. تاقیكردنەوەكە شێوازێكی كلاسیكی هەبوو. پرسیارەكان پێنجیان وێژەیی و پێنجیشیان زانستی بوون.

جۆش و خرۆشەكەم نوێ بووەوە، خۆم كۆكردەوە. بە خوێندنی هەموو ئەو دوعایانەی دەمزانین، یارمەتیم لە پەروەردگار دەخواست. لەبەرئەوەی ئەم تاقیكردنەوەیە، یان ئەوەتا بە شێوەیەكی مەعنەوی دەبێتە مایەی بەردەوامی ئەم ژیانەم، یان دەبێتە هۆكاری شكست و لەناوچوونم.

زۆر بە وردی چاوم بە پرسیارەكاندا گێڕا، لە نێو پرسیارە زانستییەكاندا شیكردنەوەی یەك دوو هاوكێشەی بیركاریم زۆر بەلاوە قورس بوو. دەمزانی بۆ ئەوەی كە لەم تاقیكردنەوەیەدا دەربچم دەبێت وەڵامی هەموو پرسیارەكان بدەمەوە. دەستمكرد بە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی كە وەڵامەكانیانم دەزانی. ماوەیەك

بەو شێوەیە چاوم بە هۆڵەکەدا خشاند. کە سەیر دەکەم، هەندێ مامۆستای چاودێر، یارمەتی هەندێ لە قوتابییەکان دەدەن وتم:

– ئای هاوار! ئەگەر ئەم مامۆستایانە هەر یەکەو قوتابییەك ڕزگار بکەن، لەوە ناچێت بێتە سەرەی من .

سەرلەنوێ کەوتمەوە ناو بێ ئومێدی، دەستەکانم وشك بوون، نەمتوانی هیچ بنووسم.

دوای ماوەیەك هاتمەوە سەر خۆ.

وەك دڵدانەوەیەك بەخۆمم وت:" هیچ نەبێ با چەندە دەتوانم وەڵام بدەمەوە، خۆ ئەگەر دەریش نەچووم ئەوا گرنگ ئەوەیە هەوڵی خۆم دابێت". گەڕامەوە سەر تاقیکردنەوەکە.

وەڵامی هەموو پرسیارەکانم دابوویەوە بێجگە لە سێ هاوکێشە، هاتمە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەوانی دیکەم زۆر باش وەڵام داوەتەوە.

ئەوەندە زۆرم لە خۆم کرد و خۆمم تۆقان، کە خۆمم بۆ نەگیراو بە بێ دەنگی دەستمکرد بە گریان .

– ئەی پەروەردگارا یارمەتیم بدە، ئیتر تەواوبووم. ئەمە کۆتا هەلە. (لەبەر خۆمەوە هەر دەکوڕوزامەوە).

مامۆستایەکی ئافرەت کە تەمەن مامناوەند بوو و لە نێوان ڕیزەکاندا دەگەڕا، لێم نزیك بووەوە. وتی:

– ڕۆڵەکەم خێرە. بۆچی دەگریت ؟

– وتم: مامۆستا، بێجگە لەم سێ پرسیارە پرسیارەکانی ترم وەڵام داوەتەوە. بەڵام لەمانە دڵنیا نیم. ئەگەر وەڵامیان نەدەمەوە بەڕاستی هەموو شتێك تەواو دەبێت...

– ڕۆڵەکەم، بۆچی تەواو دەبێت. ژیان بریتی نییە لەم تاقیکردنەوەیە. زۆر بواری ترت دێتە بەردەم... دەی لەسەر وەڵام دانەوەکانت بەردەوامبە...

ماوەیەك چاوی بەو هاوکێشانەدا خشاند کە نەمتوانیبوو شیکاریان بکەم.

– سەیرکە، بەڕاستی وەڵامی یەکێك لەو هاوکێشانەت داوەتەوە. دووەمین هاوکێشەش ڕێگاکەی ڕاستە ، بەڵام پیایدا بچۆرەوە دەیدۆزیتەوە. زۆر بەباشی بیر لە دوایین هاوکێشەیان بکەرەوە...

دوای ئەوەی سەرلەنوێ هیوای پێ بەخشیم، مامۆستا ئافرەتەکە ڕۆیشت و لێم دوورکەوتەوە ئەو هەڵەیەی کە لە دووەم هاوکێشەدا باسیکرد دۆزیمەوە و شیکارم کرد. بەڵام نەمتوانی دوایین هاوکێشە شیکار بکەم.

لەو ساتەدا تاقیکردنەوەکەش تەواو بوو...

وامدەزانی هەموو دونیا بەسەرمدا ڕووخاوە. ئومێدەکانم کوژانەوە. ناچار دەفتەرەکەم هەڵگرت. بردم بۆ لای ئەو مێزەی کە لەنزیك دەرگای چوونەدەرەوەدا دەفتەرەکانی لەسەر کۆدەکرایەوە. مامۆستا ئافرەتەکەش لای مێزەکە دەفتەرەکانی جیا دەکردەوە.

دەفتەرەکەم لەسەر مێزەکە دانا. کەمێك بەبێ ئومێدی و، ناچارییەوە وتم:" مامۆستا، سوپاست دەکەم". دەفتەرەکەم داناو ڕۆیشتم.

چەند هەنگاوێکم نا بوو، هەستم بە دەنگی بەرزی مامۆستا ئافرەتەکە کرد ڕاست ڕووەو من وتی:

– تۆ، سەیرمکە بێ مێشك، بیرت چووە ناوت لەسەر دەفتەرەکە بنووسیت. وەرە دەی بینوسە.

بۆ ساتێك سەرسام بووم. چۆن دەبێت بیرم بچێت. یەکەم جار ناومم نووسی. زۆر بەباشی دەهاتە بیرم.

بە سەرسامییەوە لێی نزیك بوومەوەو، دەفتەرەکەم لە دەستی وەرگرت. بەبێ دەنگی پێی وتم:

– ئەو هاوکێشە بیرکارییەت بە هەڵە شیکار کردووە. بەو شێوەیە دەبێت. هەر ئەوەندەی وەڵامەکەی پێ وتمەوە لێم دوورکەوتەوە .

بە گەرم و گوڕییەوە وەڵامی ئەو پرسیارەشم دایەوە. بەڕاستی یەکجار دڵخۆش بووم، وامدەزانی هەموو دونیا موڵکی منە.

مامۆستا ئافرەتەکە بە ڕوویەکی خۆش و دەم بە پێکەنینەوە بەڕێی کردم. وتی:

– دەی ڕۆڵەکەم، بە ئیزنی خودا سەرکەوتوو دەبیت و دەردەچیت، هەفتەی داهاتوو ڕۆژی دوو شەممە ئەنجامەکان بە دەروازەی قوتابخانەکەدا هەڵدەواسرێت، وەرە سەیری بکە...

منیش له دڵی خۆمدا دەموت:"تۆ بڵێی ڕۆژی دووشەممە بێت، ئایا چۆن دڵی مرۆڤ بەرگە دەگرێت بۆ یەك هەفتەی ڕەبەق لە چاوەڕوانی و نیگەرانیدا بێت؟ ئەم ڕاستییە ئەو قوتابییانە باش دەیزانن کە چوونەتە تاقیکردنەوەوە و چاوەڕوانی ئەنجام دەکەن".

لە کۆتاییدا ئەو ڕۆژی دوو شەممەیەی کە باسی کرد لەگەڵ ئەو ٦٠٠ قوتابییەی دیکەدا لەبەردەم قوتابخانەکەدا چاوەڕوانی ئەنجامەکەمان دەکرد.

قوتابیەکانی دەوروبەرم هەستیان بەو تامەزرۆییەی من نەدەکرد، جا هەندێکیان لەگەڵ دایك و باوکیاندا هاتبوون، بەترسەوە چاوەڕێی ئەنجامەکانیان دەکرد.

یەکێك لە فەرمانبەرانی قوتابخانەکە، لیستی ناوی سەرکەوتووەکانی هێناو، بە شوشەی دەرگای قوتابخانەکەدا هەڵیواسی. بەڵام ئەوەندە قوتابی لێبوو نەمدەتوانی لێی نزیك ببمەوە و بیخوێنمەوە. قەرەباڵغیەکی زۆر دروستبوو، هەر قوتابییەك دەیویست بگاتە لیستەکەو ئەنجامەکەی خۆی بەرچاو بکەوێ.

لەبەرئەوە فەرمانبەرێکی قوتابخانەکە وتی:

– هاوڕێیان، هیچ پێویست بەم قەرەباڵغییە ناکات، ئەگەر هێمن بن و بەبێ دەنگی گوێم لێ ڕابگرن. ئەوا بە دەنگێکی بەرز ناوی ئەوانە دەخوێنمەوە کە دەرچوون. هەمووتان گوێبگرن.

هەر کە گوێیان لەم قسانە بوو دەستبەجێ هەموویان بێ دەنگ بوون و بەدیقەتەوە گوێبیستی ئەو ناوانە بوون کە دەخوێندرانەوە .

فەرمانبەرەکە بە خوێندنەوەی ناوی (خالید ئێرتۆغروڵ) دەستی پێکرد .

ئەمە خۆشییەکی بڕوا پێنەکراو بوو، چاوەڕوانیی و خەیاڵی چەندین ساڵە بوو.

نەمدەتوانی چیتر بەپێوە ڕاوەستم و هەر لە شوێنی خۆم دانیشتمو، لە خۆشیدا دەستم کرد بە گریان...بە هیچ شێوەیەك خۆمم پێ هێور نەدەکرایەوە.

ئافرەتێکی بە تەمەن کە خزمی قوتابییەك بوو لێم نزیك بوویەوەو، دەستی گرتم وتی:

- ڕۆڵەکەم، بۆچی دەگریت؟ خودا کەریمە. خۆ ئەم تاقیکردنەوەیە کۆتایی دونیا نییە. إن شاءالله جارێکی تر بەشداری دەکەیتەوە. خودای گەورە دەرگایەکی ترت بۆ دەکاتەوە.

ئافرەتە بە تەمەنەکە نەیدەزانی لەخۆشیدا دەگریم، وای دەزانی دەرنەچووم بۆیە دەگریم .

هەستامە سەر پێو، خۆم گورج کردەوە. پاشانیش چوومە ناو بینای قوتابخانەکەوە بۆ ئەوەی ئەو مامۆستا ئافرەتە بدۆزمەوە کە یارمەتی دام، ویستم لە یەکێك لە فەرمانبەرەکانی قوتابخانەکە بپرسم کە ئەو مامۆستا ئافرەتە کێیە و لە کوێ دەتوانم بیدۆزمەوە .

کاتێ کە تەواو چوومە ناو قوتابخانەکەوە لەنزیک ژووری بەڕێوبەردا، لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا ڕووبەڕووبوومەوە.

بە خۆشەویستی و میهرەبانییەوە وتی:

چاوت ڕوون ڕۆڵەکەم، زۆرم پێخۆشبوو کە سەرکەوتیت.

دەستی مامۆستا ئافرەتەکەم گرت، دیسان لە خۆشیاندا نەمتوانی فرمێسکی چاوەکانم ڕابگرم. وتم:

– مامۆستا، ئێوە دەزانن یارمەتی کێتان داوە. لەڕاستیدا یارمەتی قوتابییەکتان داوە کە دەستکورتترین قوتابییە. بەڕاستی ژیانی منتان ڕزگار کرد.

باسی حاڵی خۆم و ئەو هۆکارانەم بۆ کرد کە بوونەتە پاڵنەر بۆ ئەوەی حەزم لە پیشەی مامۆستایەتی بێت. مامۆستا ئافرەتەکەش بە بیستنی قسەکانم زۆر هەستی بزواو فرمێسک بەچاوەکانیدا هاتەخوارەوە. وتی:

– ئا هەر بەو شێوەیە! ئێستا بۆ ئەم ئیشە زۆرم پێ خۆشبوو. بەڵام ئاگاداربە وا نەزانی بە پاڵپشتی دەرچوویت. ئەگەر کۆتا پرسیاریشت وەڵام نەدایەتەوە هەر دەردەچوویت.

ویستی بەم قسانەی دڵم بداتەوە. ئەو مامۆستا بەڕێزە، مامۆستای بیرکاری قوتابخانە سەرەتاییەکە بوو. وتم:

– مامۆستا، بۆچی یارمەتیت دام؟

مامۆستا چاوەکانی لە خەیاڵدا ڕۆچوون، وەك بڵێی لەدوورەوە شتێکی مانـاداری دۆزیبێتـەوە، نیگاکـانی لـە خاڵێکـدا وەسـتاند و فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتنە خوارەوە .

دوای وشك کردنەوەی فرمێسکەکانی بە دەستەسڕەکەی. وتی:

– ڕۆڵەکەم، کوڕێکم هـەبوو زۆر لـە تـۆ دەچـوو. هـاوینی ڕابـردوو هەم کوڕەکەم و هەم باوکیشـیم لـە دەسـتدا. بۆیـە کـاتێ تـۆم بینـی نەمتوانی خۆم ڕابگرم و هۆگرت بووم. تۆ نازانی دڵی دایك چۆنە.

ئەی خودای مەزن! ئەگەر بتـەوێت کارێـك بـۆ بەنـدەکانت ئاسـان بکەیت، هۆکارێکی لـەم شـێوەیە دەهێنیتـە مەیـدان و بۆیـان ئاسـان دەکەیت...

تا قوتابخانە تەواو بوو ئەو مامۆستا بەڕێزە بـۆ مـن بـووە دایـك و بـەردەوام توانـای ڕۆحـی پـێ دەبەخشـیم. یارمـەتیو پاڵپشـتیی و هاندانەکانی هێندە زۆرن لەباس نایەن.بە وتە پرشنگدارەکانی ژیـانی ڕووناك کردمەوەو، لە ڕۆژە سەختەکانی ژیانمدا دەستی هاوکاری بـۆ درێژکردم و دەستی گرتم. قوتابییەکانی قوتابخانەکـە لـەم مرۆڤـەوە پەروەردەیەکی زۆر گرنگیان لە بەهاکانی ورەبەرزی و، ئیمانی تـەواو و، خۆشەویستی میللەت و وڵات وەرگرت.

زۆر سوودمان لێوەرگرت. لـە کەسـێتی ڕاسـتەقینەییو، نیشـتمان پـەروەری و، بەندایـەتی بـۆ خـوای پـەروەردگارو، نموونـەیی بـوون لەوەوە فێربووین.

پاش تەواوبوونی قوتابخانە لەگەڵ مامۆستادا ماوەیەك نامەمان بۆ یەکتر دەنارد. بەڵام دوای ئەوە ١٧ ساڵی تەواو چاومان بە یەکتری نەکەوت. زۆر ئارەزووم دەکرد لەو ماوەیەدا سەردانی بکەم، بەڵام بە جۆرێك لەجۆرەکان قسمەت نەبوو.

لە ساڵی ١٩٩٤ دا، لە وەزارەتی پەروەردەی میللی، کاتیّ کە ئەرکی ڕاوێژکاری وەزارەتم بەڕێوە دەبرد. لەگەڵ ئەو مامۆستایەمدا کە ژیانی پێبەخشیمەوە پاش ١٧ ساڵ بەیەکتر شاد بووینەوە.

مامۆستا بەهۆی جێبەجیّ کردنی دامەزراندنێکەوە هاتبوو بۆ وەزارەتی پەروەردەی کاری میللی. لەبەرئەوەی دامەزراندنەکە کێشەی تێدابوو بۆیان جێبەجیّ نەدەکرد. لەویّ فەرمانبەرێکی ناسیاوی ناوی منیان پیّ وتبوو. وتبووی:

– ئەو ڕاوێژکارە دەتوانیّ بە شەخسی ئەم دامەزراندنە جێبەجیّ بکات.

بەڵام مامۆستا نەیزانیبوو کە من قوتابییەکی خۆی بووم، دوو ڕۆژ هەوڵیدابوو چاوی بە من بکەوێت. سکرتێرەکە ئەمەی پیّ ڕاگەیاندم. لەو ڕۆژانەیشدا بەرنامەیەکی قورسمان پیادە دەکرد. ئەو مامۆستا ئافرەتە دوو ڕۆژ بوو بە دوای مندا دەگەڕا، منیش نەمدەزانی کە مامۆستاکەمە.

هاتە ژوورەکەمەوە، بە بینینی حەپەسام!! لەدڵی خۆمدا وتم: تۆ بڵێی ئەوە مامۆستاکە بێت؟ وتی:

– ڕاویژکاری بەڕێز، مـن بـۆ جێبـەجیٚ کردنـی کارێك هـاتووم کـە کێشەی تێدایە، بەڵام بۆم ئـەنجام نـادەن. منـیش دوای تـەواوکردنی ئـەم کـارە خانەنشـین دەکـرێم. وتیـان تـۆ دەتوانیـت ئـەم کێشـەیە چارەسەر بکەیت. ئەگەر دەتوانیت یارمەتیم بدە.

پـیر بووبـوو، پشـتی چـەمابووەوە...بـۆ ئـەوەی دڵنیـا بـبم کـە مامۆستاکەمە نموونەی بڕیارنامەکەم لە دەستی وەرگرت.

لە شوێنی خۆم هەڵسام وتم:

– مامۆسـتا گیـان، شـەرەفمەندت کـردین. چـووم دەسـتی مـاچ بکەم .

زۆر سەرسام بوو وتی:

– ببورە بەڕێز، بڕوابکە نەمتوانی بتانناسم .

– وتم: من (خالید ئێرتوغروڵ)م.

– ئائائا، خالید گیان، تۆی. بە وتنی ئەمانە تەواو وەك دایکێکی میهرەبان و بەسۆز باوەشی بۆ کردمەوە، منی لە جێـی ئـەو کـوڕەی کە چەندین ساڵ بوو کۆچی دوایی کردبوو لە باوەش گرت. وتی:

– خالید، لە خۆشیدا وا دەزانم هەموو دونیا هی منە، بینینـی تـۆ ئەم ئەنقەرەیـەی بـە مـن بەخشـی. خۆشـی و کامـەرانی لەمـە زیـاتر نابێت.

بەڵێ، مامۆستاکەم ڕاستی دەوت: "گەورەترین سەرمایەی مامۆستایەکی ڕاستەقینە، ئەو قوتابیانەیەتی کە لەسەر چاکەخوازی بۆ میللەت و نیشتمان و، ڕێزگرتن لە دین و ئیمان پێی گەیاندوون".

خوای پەروەردگار، بمانخاتە ناو پۆلی مامۆستایانی لەم شێوەیە.

ئەم بیروباوەڕە بکاتە قسمەتی مامۆستا گەنجەکانی هاوڕێشم.

ئەمڕۆ، هەموو خێزانێك پێویستی بە مامۆستایەکی لەم شێوەیە هەیە.

پاراستنی نیشتمان و، ئاسوودەیی میللەت پێویستی بە بوونی مامۆستایانی لەم شێوەیەیە.

ئیتر لە خزمەتی مامۆستاکەمدا بووم، ئەو چی بخوازێت، بە ئەنجامی دەگەیەنم.

## نەخۆشی شێرپەنجە

# خێزانێکی ڕزگارکرد

بەمەبەستی بەشداری کردن لە کۆنفرانسێکدا ڕۆیشتم بۆ پارێزگایەکمان، دوای تەواوکردنی کارەکانم بۆ شوێنکاری هاوڕێیەکم دەگەڕام کە دەرمانساز بوو و هاوڕێی قۆناغی ناوەندیم بوو. ئەو ناونیشانەی کە لە دەفتەری تێبینییەکەمدا نووسی بووم نیشانی پیاوێکم دا کە تەمەنی مامناوەندبوو زۆر بە زەحمەت بەسەر شۆستەکەدا هەنگاوی دەنا.

ناونیشانەکەی خوێندەوە و نەخوێندەوە ئاوڕی لێدامەوە وتی:

– سەیری ئەم کارە، چ ڕێکەوتێکە! منیش دەچم بۆ ئەو شوێنە.

بەیەکەوە دەستمانکرد بە ڕۆیشتن پرسی:

– دەیناسی؟

– وتم: هاوڕێمە.

بەردەوام بوو وتی:

– کاک ڕەسوڵ کەسێکی زۆر باشە، هاوڕێی منیشە.

– هاوڕێی هاوڕێکەم بە هاوڕێی منیش ئەژمار دەکرێت. کەواتە با یەکتر بناسین.

یەکەمجار پێکەنین. پاشانیش بە تەوقە کردنەوە خۆمان بە یەکتر ناساند. هەتاوەکو چووینە دەرمانخانەکەشەوە هەر قسەمان دەکرد.

ساڵانێکی دوورو درێژ کاک ڕەسوڵم نەدیبوو، پاش ماوەیەک لە ڕۆیشتن چووینە بەردەم دەرمانخانەیەکی گەورە.

لەگەڵ کاک عاسفدا کە لە ڕێگەدا یەکترمان ناسی چووینە ژوورەوەو بەرامبەر یەکتری دانیشتین. پاش کەمێکیش کاک ڕەسوڵ هات بۆ لامان، دەمەتەقێیەکی خۆش دەستی پێکرد.

کاک ڕەسوڵ بە ئاوڕدانەوە بۆ کاک عاسف وتی:

– دەتزانی کە کاک خالید نووسەرە؟

کاک عاسف بە جۆش و خرۆشێکەوە وتی:

– ئایا ئەو خالید ئێرتوغروڵە؟

کاک ڕەسوڵ بە شێوازێکی کەمێك گاڵتە ئامێزەوە وتی: بەڵێ.

دەستبەجێ کاک عاسف هەستایە سەر پێ وتی:

– کاکی بەڕێز، کاتێ لە ئاسمان بە شوێنتدا دەگەڕێم لێرە دەتدۆزمەوە، لێم نزیك بووەوە و لە ئامێزی گرتم.

کاک عاسف لە ناو جۆش و خرۆشێکی سەرسوڕهێنەردا بوو.

کەوتە قسە کردن.. وتی:

– کتێبەکانت ژیانی ئێمەیان گۆڕی. بەردەوام دوعات بۆ دەکەین.

کاک ڕەسوڵ بە بڕینی قسەکانی کاک عاسف، وتی:

– کـاک عاسـف، کـاک خالیـد ئاگـاداری ئـەو ڕووداوە نییـە. لـە سەرەتاوە بۆی باس بکە با گوێ بیستی بێت.

کاک عاسف هەناسـەیەکی قـووڵی هەڵکێشـاو، بـەئازارەوە خـۆی گرمۆڵەکرد و ڕووخساریشی زیاتر چرچ کـرد و چـاوەکانی گێڕایـە نـاو ئازارێکی نادیارەوە وتی:

– ئائائاه! ئەو ڕووداوە. ئائائاه خوایە گیان.

مامۆستا، من زۆر دەوڵەمەند بووم... لەبەرئەوەی منداڵە تاقانەی باوکی خوالێخۆشبووم بووم، میراتێکی باشم بۆ مابووەوە.

هاوسەرداربووم، خوای پەروەردگار کچێکی پـێ بەخشـین کـە بـە تەواوی وەك تۆپە گوڵ وابوو. زۆر دڵخۆش بـووین، هـەموو شـتێکمان هـەبوو. خێزانێـك بـووین کـە لـە ژیانـدا هـەموو شـتێکمان دەسـت دەکەوت، هەموو کەس بەخیلی پێدەبردین.

هەتاوەکو ئەو هەواڵە ناخۆشەمان بیست...

کچـەکەم دەسـتی کردبـوو بـە خوێنـدنی قۆنـاغی ئامـادەیی. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو بێ هێـزی و لاوازی دەچـوو، کـاتێ بردمـان بـۆلای پزیشك زۆر درەنگ بوو، تووشی شێرپەنجەی خوێن بووبوو.

ئەم هەواڵە ئێمەی سوتاند، لـە نـاوی بـردین. بـە هـیچ شـێوەیەك دانمان پیادا نەدەنا، هەموو سەروەتو سامانمان بۆ چارەسـەرکردنی

لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات سەرفکرد ... بەڵام بێ هودە بوو ... بە هیچ جۆرێك نەماندەتوانی چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە. بە بەردەوامی لە یاخی بووندا بووین. وەك ئەوەی بڵێی حاشا وا بیرماندەکردەوە کە خوای گەورە زوڵمی لە کچەکەمان کردبێت. هەم ڕۆڵەکەمان بە بەرچاومانەوە تیادەچوو، هەمیش وەك کاردانەوەیەك ئێمە خوای پەروەردگارمان تاوانبار دەکرد. بەم شێوەیە ئەو ئیمان و باوەڕە کەمەی لە ناخماندا بوو نەما، ( حاشا) بەحسابی خۆمان بەم شێوازە تۆڵەمان لە خودا دەکردەوە .

ئەوەمان لە کچەکەمان شاردەوە کە بەرەو کۆتاییەکی ترسناك دەڕوات، بەڵام ئەویش هەستی بەم مەترسییە کردبوو. منیش و دایکیشی کەوتبووینە ناو قەیرانێکی ناهەموارەوە. بیری لێبکەنەوە، تاقانەکەمان لەدەست دەدەین. چۆن بتوانین لە شیرینترین ساتەکانی گەنجیدا بە خاکی بسپێرین. دایکی نەیتوانی زیاتر بەرگەی ئەمە بگرێت، تووشی تەنگژەی دەروونی بوو، دەستی کرد بە وەرگرتنی چارەسەر . بەڵام خوای پەروەردگار ئەگەر بەڵایەك بدات بەسەر هەر کەسێکدا بەهەر جۆرێ بێ هەزارەها حیکمەتیشی پێوە دەنێرێت. ئەوەی ئێمەش بەو شێوەیە بوو .

خوای پەروەردگار بەهۆی نەخۆشی کچەکەمەوە بەتەواوی ژیانمانی گۆڕی، دەرگایەکی ڕووناکی بەڕووی ژیانی تاریکماندا والاکرد.

برینپێچێك هەبوو کە چاودێری نەخۆشی کچەکەمی دەکرد. خانمێکی زۆر ڕووخۆش و بەڕێز بوو.

بەردەوام هەوڵی دەدا دڵی کچەکەمان بداتەوەو یارمەتی بدات بۆ ئەوەی بیرکردنەوەی بەرامبەر بە نەخۆشییەکەی و مردن بگۆڕێت، بۆ ئەو مەبەستەش کتێبی (ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگەڕێت)ی ئێوە و (پەیامی بیماران)ی حەزرەتی بەدیع و زەمانی بۆ هێنابوو.

ئەم کتێبانە بە جۆرێك بووبوون بە دڵنەواییەکی باش بۆ کچەکەم کە ناتوانم باسی بکەم. کچەکەم بەو تەمەنەوە دەستیکرد بە دڵدانەوەی ئێمەو دەیوت:

– بابە ئیتر هیچ نیگەران نابم. ئەو پەروەردگارەی منی دروستکردووە، ئەگەر بیەوێت ئەمژێنێت، بیشیەوێت دەممرێنێت. ئەو زاتە باشترین ئەنجام و کۆتایی بۆ بەندە باوەڕدارەکانی فەراهەم دەکات، ئیدی لەبەرچی خەمبار بین. ئەو زاتەی ئێمەی دروستکردووە دەمانمرێنێت و دەمانبات بۆ شوێنێکی ئارام. لەو دونیادا، لە بەهەشتدا بەیەکتر شاد دەبینەوە. لەوێ ئێش و خەم و کەسەر و نەخۆشی بوونیان نییە. هەموو مرۆڤە مەزنەکان، پێغەمبەرەکان، صەحابەکان، دایك و باوانم لەوێن. ئیتر بۆچی لە مردن بترسین؟ هەر خودا بەدیمان دەهێنێت و هەر ئەویش دەمانباتەوە...

کچەکەم دەستی کرد بە نوێژ کردن. زۆر هەستی بەدڵنیایی دەکرد. بە جۆرێك ئیمانی بەدەستهێنا بوو کە قەناعەتی تەواوی بۆ دروست بوو بوو بەرامبەر بە مردن.

زۆر لە ئێمە دەپاڕایەوە و دەیوت:

– پەرستشەکانتان ئەنجام بدەن، ئەگینا لەو دونیا خوای پەروەردگار لە یەکتریمان جیا دەکاتەوە. من نامەوێت لە ئێوە جیا ببمەوە. فەرمانەکانی خودا جێبەجێ بکەن تا لەو دونیاشدا بەیەکەوە بین .

مامۆستا گیان، کتێبەکانتانمان خوێندەوە، پاشانیش پەیامەکانی نوورمان خوێندەوە. زۆر سوپاس بۆ خوای گەورە کە قسمەتی خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی پێداین. کە لە ڕێگەیانەوە لە ئامانجمان تێگەیشتین‌و، هەستمان بە بەندایەتییمان کرد. درکمان بەوە کرد کە دونیا کاتییە و شوێنی تاقیکردنەوەیە.

هەزارەها سوپاسی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگار، کە إن شاءالله ئەو نەخۆشییە هەم پلەی شەهیدی ڕۆحی کچەکەمی بەرز کردەوە، هەم چاوی ئێمەیشی کردەوە. کچەکەم لە باوەشمدا کۆچی دوایی کرد. بە شێوەیەك گیانی سپارد کە هێشتا دەترسم باسی لێوە بکەم. لە کۆتا هەناسەیدا، خەندەیەکی شیرین لێوەکانی کردەوە. ڕووخساری گەش گەش داگیرسا. بە چاوە فرمێسکاوییەکانییەوە ئاوڕێکی لە دایکی دایەوە کە تەماشای دەکرد وتی:

– دایکە گیان، مەگری، پیرۆزبایم لێبکە. ئێستا شوێنێکی زۆر خۆش دەبینم کە ناتوانم باسی لێوە بکەم. دڵنیام لەوێ زۆر دڵخۆش دەبم. تەماشاکە، بانگم دەکەن. هەمووشیان ئافرەتانی نوورانین. جل و بەرگەکانیان چەندە جوانە. ئەوەتا زەردەخەنەم بۆ دەکەن. دایکە گیان، ئیتر پێویستە بڕۆم.

کچەکەم بە دەم شەهادەت هێنانەوە گیانی سپارد.

پەنا بە تۆ خوایە گیان! بەزەیی‌و، لێبووردەیی‌و، نیعمەتەکانت چەندە جوانن! هەر ناخۆشییەك کە بەندەکانتی پێ تاقی دەکەیتەوە، جۆرە دەرمانێکە. هەر نەخۆشیەك کە دەینێریت، جۆرە شیفایەکە .

هاوسەرەکەم پاش چەند ڕۆژێك لە کۆچی دوایی کچەکەم خەونێکی بینی.

بینیبووی کچەکەمان لە شوێنێکی زۆر ڕووناك‌و، شاد و ئاسوودەییدایە.

لە تەنیشت کچەکەمەوەو، زاتێکی جوان و نوورانی، بە هاوسەرەکەمی وتبوو کە: "نیگەرانی کچەکەتان مەبن، من چاودێری ئەوم گرتۆتە ئەستۆ، دیسان ڕادەستانی دەکەمەوە". هاوسەرەکەم بەو زاتەی وتبوو: "ئێوە کێن؟"، ئەو زاتەش وتبووی: "من حەزرەتی ئەبوبەکرم".

واته حەزرەتی ئەبوبەکر کچەکەمان وەك ڕۆڵەیەکی ڕۆحی دەباتە لای خۆی. ئەمە یارمەتییەکی گەورەی خوای پەروەردگارە و نامەیەکی قووڵ و پڕ مانایە بۆ ئێمە.

***

ئەو یادەوەرییەی کە کاك عاسف باسی کرد. بە قووڵی کاری کردە سەر ئێمە. بە جۆرێك کە چاوەکانمان پڕبووبوون لە فرمێسك. ئەو ڕاستییانەی گوێ بیستی بووین، نابێتە قسمەتی هەموو مرۆڤێك. لەناخەوە دەپاڕاینەوەو دەمانوت:

پەروەردگارا! لەدونیادا هیدایەتمان بدەو کۆمەکیمان بکە کە بە ئیمانی ڕاستەقینەوە بگەڕێینەوە بۆ بەردەم بارەگاکەت.. ئامین.

# کۆتا ساتەکانی

## کاک سالم



کاک سالمی بەڕێز مرۆڤێکی دەوڵەمەندو، جەربەزەو، ناسراو بوو. دەستی بخستایە سەر هەر کێشەیەك چارەسەری دەکرد، هەر شتێکی بویستایە بەدەستی دەهێنا و بیری لە هەر شتێك بکردایەتەوە دەیکرد.

لە نێوان فەرمانبەرانی میری‌و، کەسە سیاسییەکانی دەوروبەری و کەسە دەوڵەمەندەکاندا هاوڕێی متمانەدار و کاریگەری هەبوو .

پاش ئەوەی کە بەساڵاچوو، بۆ ئەوەی ژیانێکی هێمن بەسەربەرێ و، لە جوانیی دەریا و تیشکی خۆر و، سەرنجڕاکێشیی هەوارگەی هاوینە و زستانە ببینێ، لە مێرسین نیشتەجێ بوو .

لەبەرئەوەی کە پێش ساڵانێکی دوور و درێژ هاوسەرەکەی کۆچی دوایی کردبوو، لەگەڵ شۆفێرەکەیی و خزمەتکارەکەیدا بەیەکەوە دەژیان. کوڕە تاقانەکەشی کە ناوی زەکی بوو، بەهیچ جۆرێك بەتەنها بەجێی نەدەهێشت .

زەکی هاوڕێی قۆناغی سەرەتاییم بوو. قوتابیەکی زیرەك بوو، جیاواز لە باوکی مرۆڤێکی سەربەرزو، بەڕێزو، سادەو، دیندار بوو.

باوکی زەکی لەژیانیدا هیچ ئەرکێکی بەندایەتی بەجێ نەدەهێناو، بەردەوام سەرقاڵی کاری دونیایی بوو.

ئەو زەکییەی کە فەرمانەکانی خودای بەشێوەیەکی ورد بەجێدەهێنا، زۆر خەفەتی بۆ باوکی دەخوارد. هەر جارێ کە ئەم باسەی بەبیری باوکیدا دەهێنایەوە، وەڵامی زۆر ڕەقی وەردەگرتەوەو، هەموو جارێك باوکی دەیوت:

– خۆت لە ئیشی من هەڵمەقورتێنە.

بەشێوەیەکی زۆر ڕەق وەڵامی دەدایەوە.

بەهۆکارێك ڕێم کەوتە مێرسین، سەردانی زەکی هاوڕێم کرد. ئەو ئێوارەیە باوکی واتە کاك سالمیش میوانی بوو .

گفتوگۆکەمان سەبارەت بە ناوەڕۆك و سروشتی مرۆڤ و، فەرمانەکانی بەندایەتی بوو. کە هاتینە سەر ئەوەی بۆچی و لەبەرچی دەژین، زەکی ئاوڕی دایەوە بۆ لای باوکی و، لە دڵەوە و، بە دڵسۆزیی و تکاکردنەوە وتی:

باوکە، ئیتر سەرزەنشتم مەکە، مەم شکێنە. گوێ لە وتەکانم بگرە. من کوڕی تۆم. ئەو مافەم پێ بدە .

تۆ چوویتە تەمەنەوە، بەڕاستی پێویستە ڕووبەڕوو قسە لەسەر هەندێ شت بکەین، کاتێ کە مۆڵەتم نادەیت زۆر خەفەت دەخۆم، چی دەبێت باوکە گیان، ئیتر خەمبارم مەکە .

کاك سالمی باوکی لەبەرئەوەی کە لەوێ میوان بوو، ماوەیەك دەنگی لێوە نەهات، پاشانیش بە دەنگێکی سارد و بەرهەڵستیکارییەوە وتی:

- دەزانم دەتەوێت چی بڵێیت، بەڵام ئەگەر دەتەوێت جارێکی تریش خۆت ماندوو بکەرەوە .

زەکی بە وەرگرتنی نیوە مۆڵەتێك لە باوکی بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە دەستی بە قسەکانی کرد وتی:

- باوکە گیان، تەمەنت لە ٧٠ ساڵی تێپەڕییووە، لە کۆمەڵگاکەماندا تەمەنی ٧٠ ساڵی تەمەنێکی کەم نییە، خودا تەمەن درێژت بکات، بەڵام لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئەوانەی زۆرترین دەژین زۆر کەم ٩٠ ساڵ تێدەپەڕێنن. واتە تەمەن دەگوزەرێ و، کات تەواو دەبێت .

تەماشای ژیانی بوونەوەران و سیستمی ئەم دونیایە بکە! بۆ ئەوەی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی بەردەوام بێت، خوای گەورە هەموو لایەکی سەرزەوی بە نیعمەتی جۆراوجۆر ڕازاندوەتەوە. هەموو دروستکراوو نیعمەتەکان خزمەت بە مرۆڤ دەکەن. خوای گەورە ئەم سیستەمە ناوازەو ڕێکوپێکەی خولقاندووەو، هەر پێکهاتەو بونەوەرێك لە چوارچێوەی ئەم سیستم و ڕێسایەدا ئامانجێکی هەیە. لەم دونیایەدا هیچ کەسێك بەبێ بەرامبەر شتێك نادات بە بەرامبەرەکەی. ئایا هێندە نیعمەتی بێ شومار و نەژمێردراو

بەخۆڕایی دەدرێت بە مرۆڤ؟ پاش خەرجییەکی زۆرو بێ سەروبەر واز لە مرۆڤ دەهێنرێت؟ نابێت هەموو ئەمانە لێپرسینەوەیەکیان هەبێت؟

زەکی بەهێمنی ڕۆیشت بۆ لای باوکی و دەستی گرت و وتی:

- باوکە گیان، تکات لێ دەکەم سەرنجی ئەم ڕاستییە بدەو، بیر بکەرەوە...

ئەم بوونەوەرە بەدیهێنەرێکی هەیە، کە ئێمەی هێناوەتە دونیاوەو، دونیای کردوەتە شوێنی تاقیکردنەوە بۆمان، لەدوای مردنیش لەڕۆژی دواییدا لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکات لەسەر ئەو کاروکردەوانەی کە لە دونیادا ئەنجاممان داون.

خوای پەروەردگار بەندایەتی لە ئێمە دەوێت، دەیەوێت گوێڕایەڵی فەرمانەکانی قورئان بین، پەرستشەکانمانی دەوێت. هەڵبەتە بۆئەوەی لە ڕۆژی دواییدا سەرفراز بین.

کاك سالم لە پڕدا قسەکەی زەکی بڕی و کەمێکیش بە شێوازێکی ڕەق وتی:

- هەموو ئەوانە دەزانم. پێویست ناکات دیسانەوە دووبارەیان بکەیتەوە. ئامانجی بەندایەتی و پەرستشەکان پاراستنی مرۆڤەکانە لە خراپەکاری. ڕاستییەکەی من خراپەم بۆ کەس نییە، هەروەها پاك و خاوێنی دڵەکان شەرتە، دڵی منیش پاکە. زەرەرم بۆ کێ هەیە؟ من پێویستم بە پەرستشیش نییە. خۆت هیلاك مەکە، من دەزانم چی دەکەم.

زەکی ویستی کەمێك زیاتر ئـەو بابەتـە بۆ بـاوکی ڕوون بکاتـەوە وتی:

- باوکـە گیـان، تـەنها بـە وتنـی " دڵـم پاکـە " دڵ پـاك نابێـت، هـەروەها بـە وتنـی " مـن خراپـەکاری ناکـەم " ڕزگـارت نابێـت لـە خراپەکارییەکان.

پاکی دڵ و ڕزگاربوون لە خراپەکارییەکان ماندووبوون و هەوڵدانی دەوێت. ئەگەر مرۆڤ لەم پێناوەدا کۆشش نەکات، قسەکانی بێ ئاکام دەبن. ئایا خانمی ماڵێك بـە وتنـی " ماڵەکـەی مـن پـاك و خاوێنـە" ماڵەکەی پاکوخـاوێن دەبێـت؟ بۆئـەوەی ماڵەکـەت پاکوخـاوێن بێـت ئەوا بە بەردەوامی پێویستی بە پاك کردنەوەیـە. مـرۆڤیش هـەر بـەو شێوەیەیە، بۆ پاك ڕاگرتنی دڵەکان و خۆپاراستن لە خراپـەکاریـەکان پێویستە بە بەردەوامی ئەرکی بەندایەتی ئەنجام بـدرێت و بـەڵێن بـە خودا بدرێت، پێویستـە بەجۆرێك بژین کە خوای پەروەردگار لێـی داوا کـردووین، ئەوکاتــە زمــان و دڵ و دەروون و ژیانــت پــاك و بێگـەرد دەبن. چونکە مرۆڤ بۆ ئەوە بەدیهێنراوە کـە پـەروەردگار (زاتـی الله) بناسێت و بیپەرستێت.

زەکـی زۆر بـە ڕێکـوپێکی و بەوپـەڕی دڵسـۆزییەوە درێـژەی بـە قسەکانی دا، بەڵام باوکی بە توندی ئیشارەتی بۆ کردو قسەکانی لـە نیوەدا پێ بڕی و وتی:

- تێگەیشتم، بەسە.

هەستایە سەر پێ و، لە ژوورەکەی چووە دەرەوە و دەرگاکەی بەسەریدا داخستەوە .

ئەو هەڵسوکەوتەی کاك سالم زۆر خەمباری کردین، بە تایبەتیش زەکی کوڕی...

پاش ماوەیەك لەگەڵ زەکی دا پێکەوە دانیشتین، بەهۆی ئەو ڕووداوەوە زۆر سەغڵەت بووین، زەکی چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك، لێوەکانی دەلەرزین. وتی:

– مامۆستا خالید، بەداخەوە باوکم لە من تێنەگەیشت، ئەو تەمەنی تەواودەبێت و، هەست بەمە ناکات. بەڕاستی چیتر نازانم چۆن ئەو کێشەیە چارەسەر بکەم و، پەنا بەخوا ئەترسم باوکم بە بێ ئیمانی بڕوات، زۆر خەمبارم، ئەم ئاگرە ناخم ئەسوتێنێت، چونکە ژیانی هەتا هەتایی بە هەدەر دەدات و... گوێ بە ڕاستیەکان نادات...

بەڵێ، ئەو ئێوارەیە بەهۆی ئەو ڕووداوەوە زۆر خەمبار بووین. زویری و دڵشکاوی زەکی ئێمەی لە ناخەوە هەژاند. منداڵێك لەو تەمەنەدا بەو ڕادەیە لە خەمی باوکیدا بێت، بەڵام ئەو بە خەمساردیەوە لە قسەو داواکانی بڕوانێت.

چەند ساڵێك بەسەر ئەم ڕووداوە کاریگەرەدا تێپەڕی، پاشان بیستم کە باوکی زەکی کۆچی دوایی کردووە.

له سەردانمدا بۆ لای زەکی، گویّ بیستی کۆتـا سـاتەکانی مردنـی بـاوکی بـووم، کـە یـەکێك بـوو لـەو ڕووداوە سـامناك و دەگمەنانـەی لەژیانمدا گوێبیستی بووم. وەك ئەوەی خـوای پـەروەردگار پـەردەی تاقیکردنەوەی هەڵگرتبێت، زۆر ئاشکرایانە ڕاستییەکانی نیشاندابوو.

بەسەرهاتی کاك سالم لـە کۆتـا سـاتەکانی ژیانیـدا بـەم شـێوەیە دەبێت:

کـاك سـالم لـە کۆتـا سـاتەکانی تەمەنیـدا، لـە سـەغڵەتییەکی سامناکدا دەبێت، بەجۆرێك کە بـەردەوام هاواردەکـات و بـاوەش بـە کوڕەکەیدا دەکات و دەڵێت:

– کوڕم، ئەوانە دێن بۆم، ڕێگەیان پیّ مەدە، دەمکوژن.

زەکی بە سەرسوڕمانەوە دەپرسێت:

– باوکە، کیّ دێت؟

– ئەو کەسانە نابینیت کە لای دەرگاکە چاوەڕوانن، تەماشا بکـە سـێ کەسـن، بـالاّ بـەرزو، ئەسمـەر و سـامناکن، ئـامێری ئەشکەنجەدانیان بەدەستەوەیە.

زەکی دەڵێت: باوکـە تەماشـا بکـە، شـۆفێرەکەت کـاك حەسـەن، خزمەتکارەکـەت کـاك یوسـف و منـی لـێین. بێجگـە لـەم سیانەمان کەسی تری لیّ نییە.

کاك سالم نە قسەکانی زەکی دەبیستیّو نە گوێی لیّ دەبێت، ئەو لە ناو ترس و سەغڵەتی بەردەوام لە کوڕەکەی دەپاڕێتەوە:

– کوڕم، دەریانکە. تەماشاکە ئەمانە بە چەقۆکانی دەستیان پارچە پارچەم دەکەن .

کاك سالم بە ئامادەبوونی سێ کەس لەلای، کۆتا ساتەکانی بە هاوار کردن و پاڕانەوە "دێن، ئەشکەنجەم دەدەن، دەمکوژن، دێن بمبەن، ڕێگەیان پێ مەدەن" کۆتایی پێدێت.

کاتێ کۆتا هەناسەش دەدات، وەك ئەوەی بڵێی بە پانزە بیست کەس ئەیخنکێنن بە ڕاست و چەپدا پەلەقاژە دەکات.

لە گیان سپاردنیدا ڕووخسارێکی سامناکی دەبێت و دەموچاوی تەواو ڕەش هەڵدەگەڕێت.

زەکی دەیوت کاتێك لای سەریەوە دانیشتبووم، هەستم بە هەموو شتێك کردبوو، بە سەرسوڕمانەوە سەیرم دەکردو دەپاڕامەوە کە بە بەزەیی و مەغفیرەتی خۆی لێی خۆش بێت.

ئەو ڕستەیەم دووبارە دەکردەوە کە لە منداڵییەوە لەبەرمکردبوو:

" مردن بۆ ئیمانداران وچانێکە لە فەرمانەکانی دونیادا. گۆڕینی شوێنێکە، سەرکەوتنێکە بۆ چوونە بەردەم خوای پەروەردگار، ڕۆیشتنە بۆ سەردانی هاوڕێیان. بۆ کافرەکانیش قەنارەی هەتا هەتاییە". (بدیع الزمان) .

بەڵێ کاك سالم لەکۆتایی ژیانیدا نە هاوڕێکانی و، نە دەوڵەمەندیی و سەروەت و سامانەکەی نەیانتوانی یارمەتی بدەن و ببنە فریادڕەسی.

ئەوەی لەپێناو دونیادا بەدەستی هێنابوو لە دونیادا بەجێیهێشت.

ئەگەر لە دونیادا زەحمەتی بۆ ڕۆژی دوایی بکێشایەو کارو کردەوەی چاکی ئەنجامبدایە، ئەوا لەگەڵ خۆیدا دەیبردن.

" گرنگــی لــە بیرنــەکردنی ئــەو ڕاســتییەی کــە (مردنــی هــەر لەدایکبوویەك و، لێپرسینەوەی هەر مردوویەك) چەند بە ڕوونی خۆی نیشــان دەکــات! چـونکە باوەڕنــەبوون بــە ڕۆژی دوایــی، بـۆ مـردن بەربەست نییە، لە چوونە ناو بەهەشت بەربەستە ".

# بابە، سبەینێ دەمرم



لەگەڵ کاک شەفیقدا بەیەکەوە لە قوتابخانەدا بووین، ئەو لە هەموو بارودۆخێکدا جیاواز بوو. گەنجێك بوو زۆر دەیخوێندەوەو، لێکۆڵینەوەی زۆری ئەنجام دەدا... لە یەك ڕۆژیدا کاتەکانی بە باشی بەڕێوە دەبرد، بێجگە لە خەوێکی چوار سەعاتی کاتێکی بەتاڵی نەبوو.

"دوو ڕۆژی یەکسان بۆ یەکتری لە زیاندان" هەوڵیدەدا بە تایبەتی ئەو فەرموودەیە پیادە بکات، هەموو ڕۆژێکی نوێ هەوڵێکی زۆری دەدا بۆئەوەی بەرهەمدار بێت .

بە هێندەی حەزی بۆ زانستە هونەری و تەکنەلۆژیەکان حەزی بە زانستی قورئانیش هەبوو. لە لایەك خۆی فێری زمانی ئینگلیزی دەکرد، لەلایەکی تریش خۆی فێری عەرەبی دەکرد. مێشکی بە وانەکانی قوتابخانە و بەو زانستانە پڕدەکرد کە توێژینەوەی لەبارەوە دەکردن، دڵ و دەروونیشی بە جوانییەکانی ئیمان و باوەڕ

پشووی دەدا، بەردەوام ورە و ئومێدی دەبەخشی. بە کورتییەکەی؛ کاك شەفیق کەسێکی جیاواز بوو .

ئەم جیاوازییەی کاك شەفیق لە ماوەیەکی کورتدا دەرکەوت. ئیتر ئەو بوو بوو بە دکتۆر شەفیقی بەڕێز، خۆی بە زانستە ماددی و مەعنەوییەکانی پەروەردە کردبوو. هەم کەسێکی زانستی و کلتوری بوو، هەم کەسێکی ئیماندار و بە بەزەیی بوو. ئیتر کاك شەفیق فریشتە ئاسا پارێزەری دەوروبەرەکەی بوو، دکتۆرێکی دیندارو تەواو بەناوبانگ بوو کە بەردەوام یارمەتی هەژارانی دەداو، پارەی لە فەقیر و غەریبەکان وەرنەدەگرت.

د. شەفیقی بەڕێز بەشێوەیەك خزمەتی خەڵکی دەکرد کە هەمیشە لەش ساغی و ئاسوودەیی ئەوان یەکەم مەبەستی بوو، هەرگیز نرخی پشکنینەکانی نەدەخستە حسابەکەوە، تەنانەت بەبێ بەرامبەر سەدان نەخۆشی هەژاری دەپشکنی، زۆر کاتیش لە گیرفانی خۆی پارەی پێ دەدان.

لەوەش زیاتر، بەشێك لەو کەسانە بە دکتۆری بەڕێزیان دەوت: "بەم گرنگیدانەی تۆ دەڵێن ئیستیغلال"، ئەویش بە هاوڕێکانی دەوت:

– خوای پەروەردگار پلەی مرۆڤایەتی‌و، ژیری و دکتۆری پێداوم، نیعمەتە مەزنانەش سوپاسگوزارییەکی زۆریان پێویستە، سوپاسگوزاری دکتۆرێك تەنها بە جێبەجێکردنی پەرستشەکانی

نییــە، مــرۆڤ بــەهۆی بوونــە دکتۆرییــەوە نابێتــە خــاوەنی هــیچ سەرمایەیەك.

ئێمەی پزیشکان سوپاسگوزاریمان بەرامبەر نیعمەتی پزیشکی ئەوەیە کە بە پەرۆشەوە یارمەتی نەخۆش و هەژارە بێچارەکان بدەین، کاتێکیش کە ئەمە دەکەین، هەیە بە گوێرەی مێشکی خۆی لێکدانەوە بۆ ئەم یارمەتییانەی ئێمە دەکات، بەڵام ئەمە هیچ گرنگییەکی نییە، چونکە ئێمە لەبەر ڕەزامەندی خودا یارمەتی پێشکەش دەکەین، بە هیچ جۆرێك بیر لەلایەنەکەی تری ناکەینەوە. ئەوان لەو نییەتەدا، زوو یا درەنگ بەهۆی ئەم نیعمەتانەوە شەرم دەکەن.

د. شەفیقی بەڕێز لەبەرئەوەی لەلایەن خەڵکەوە زۆر خۆشەویست بوو، حزبەکان خۆیان داوایان لێدەکرد ببێتە سەرۆکی شارەوانی و ئەندام پەرلەمان. بەرامبەر بەم دەستپێشخەرییە د. شەفیقی بەڕێز زۆر بەجوانی وەڵامی دەدانەوەو دەیوت:

– دڵی خەڵکی شوێن و سەڵتەنەتی منە، پاڕانەوە پاکەکانی ئەوان و داوا باشەکانیان مایەی بەختەوەری منە، ئێوە دەتانەوێ بە داوایەك بۆ شوێنێکی کورت و کاتی، من لە سەڵتەنەتێکی دوور و درێژ و جێ متمانە بێبەش بکەن.

د. شەفیقی بەڕێز نەك تەنها نەخۆشەکان، بەڵکو یارمەتی ئەوانەشی دەدا کە کاریان دەکرد، ئەو قوتابییانەی زیرەك بوون و

ئەوانەشی توانای ماددیان کەم بوو مـاڵی بـۆ دابـین دەکـردن، جـل و بەرگ و خـۆراکی بـۆ دەسـتەبەر دەکـردن و، کـە سـەردانی دەکـردن نهێنی سـەرکەوتنی بـۆ باسـدەکردن. جیـا لـەوەش، زوو زوویـش بـە بیری دەهێنانەوە کە سەرکەوتن تەنها بەبوونی پـارەو پلـە و پایـە و دەوڵەمەندی بەدەست ناهێنرێت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە مرۆڤ ورە بەرز بێـت و، بزانێـت لەبـەر چـی دەژی و، چـۆن لێپرسـینەوەی لەتەکدا دەکرێت، هەروەك گرنگی و پێویستی بـەهاکانی ئیمـان و باوەڕیشـی بە بیردەهێنانەوە.

"پێویستە وانەکانی هونەرو ئایین بەیەکەوە بـاس بکـرێن، ئەگـەر قوتـابی بەتـەنها باسـی وانـەی هونـەری بـۆ کـرا ئـەوا گومانـاویی و نکۆڵیکـار دەردەچـێت، خـۆ ئەگـەر بـە تـەنها وانـەکانی ئـایینی پـێ خوێندرا ئەوا دەمارگیر و کەللەڕەق خۆی نیشان دەدات " زوو زوو لە شێوەی بیر و ڕاکانی بەدیع و زەمانی بۆ ڕوون دەکردنەوە .

لـە نامەیـەکی (کـاك شـەفیق)دا ئـەم ڕسـتانە جێـی سـەرنجی قوتابیەکەی بوون:

"پێویستە لـە مێشـکی قوتابیـدا زانسـتو، سـەرکەوتنو، ئـەرکی بەندایەتی هەبێتو، بەرماڵەکەیشی لە چەکمەچەی مێزەکەیدا بێت".

هیچ گومانی تێدا نییە کە ئەو قوتابییەی بەم جۆرە بێت، هەم لـە سەرکەوتنێکەوە بەرەو سەرکەوتنێکی تر هەنگاو دەنێت، هەمیش بۆ

یارمەتیدانی مرۆڤەکان و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا هەموو کاتەکانی بە کاری بەسوود پڕدەکاتەوە .

کاک شەفیق ژیانێکی خاکی دەگوزەراند، لە ماڵێکی زۆر سادەو ساکاردا دەژیا، جلی سادەی دەپۆشی، ئۆتۆمبێلێکی مۆدێل نزمی لێدەخوڕی، بەجۆرێك کە لەم ڕووەشەوە سەرنج ڕاکێشبوو بۆ هاوپیشەکانی، هەندێ لە هاوڕێکانی بەرهەڵستییان دەکرد.

کاک شەفیقیش وەڵامی دەدانەوەو دەیوت:

– نەخێر، من لەگەڵ ئێوەدا لەسەر هەمان بیروبۆچوون نیم، بە پێویستی دەزانم وەك مرۆڤەکانی دەوروبەرم بژیم، ئەگەر وەك ئەوان نەژیم چۆن لە کێشە و نەداری ئەوان تێدەگەم؟ هەروەها ئەگەر لە ژیانێکی کەشخەییدا بم، مرۆڤە هەژار و بێ کەسەکان بە ئاسانی لێم نزیك نابنەوە و باسی کێشەکانیانم بۆ ناکەن.

ڕۆژێك چووم بۆ سەردانی هاوڕێ ڕێزدارەکەم کاك شەفیق، هاوسەرەکەی کە مامۆستا بوو لەبەر سەرپۆش کردن لە کار دووریان خستبۆوە، کچە چواردە ساڵانەکەشی نوورییە جگەری نەخۆشییەکی قورسی هەبوو، لەبەرئەوەی د. شەفیق لە کێشەیەکی گەورەدا بوو چووم دڵنەوایی بدەمەوە .

چوومە کلینکەکەیەوە، تەواو قەرەباڵغ بوو. نەخۆشگەلێکی زۆر دەهاتن و دەچوون، دەگریان، دەیان ناڵاند، پرسیاریا دەکرد... د.

شەفیقی بەڕێزیش بە ئارامی وەڵامی دەدانەوەو پشکنینی پێویستی بۆ ئەنجام دەدان و هەوڵی دەدا فریای هەموو نەخۆشەکان بکەوێت.

خۆم کێشایە گۆشەیەکەوە، بۆ ماوەیەك سەیری ئەو جەنجاڵییەم کرد، بەڕاستی ئەو خزمەت و فیداکارییە ناوازەیەی د. شەفیقی بەڕێز زۆر کاری تێکردم، زۆر هەستم بزوا.

لەبەر خۆمەوە، وتم:

– ئائائاه، دکتۆرەکان، چی دەبوو ئەگەر چەند کەسێکتان وەك د. شەفیق بوونایە، ئەو کاتە قەرەباڵغی نەخۆشخانەکان تەواو دەبوو، پاشکۆکان پێدەگەیشتن، سکاڵاکان کەمیان دەکرد؛ لە جیاتی نەفرەت و نەعلەت لە مرۆڤەکانەوە دوعاتان پێ دەگەیشت.

پاش تەواو بوونی پشکنینەکان د. شەفیق بە تەنها مایەوەو، دواجار بوارمان بۆ ڕەخسا کە دوای چەند ساڵ دووری چاومان بەیەکتر بکەوێت و، ڕازو نیازی دڵمان بۆ یەکتر دەربڕین.

هەرچەندە زۆر هەوڵم دا کە گوێبیستی خەم و پەژارەکانی بم، بەڵام د. شەفیق سەرباری هەموو ئەو کێشەو ناڕەحەتیانەی کە دووچاری بووبوو نە بێزاری دەربڕی و نە هیچ سکاڵایەکیشی کرد، بەڵکو بەوپەڕی ئارامییەوە وتی:

– دونیاماڵی تاقیکردنەوەیە، خوای پەروەردگار هەر بەندەیەکی بەجۆرێك تاقی دەکاتەوە، تاقیکردنەوەکەی ئێمەش بەم شێوەیەیە ... ئێمە ئەرکمان ئەوەیە کە بە ئارامی سوپاسگوزاربین.

ئەرکی ئێمە سوپاسگوزارییە نەك سکاڵا، چونکە ئێمە بەدیهێنراوین‌و خودا بەدیهێنەرە، ئێمە مافی ئەوەمان نییە سکاڵا بەرامبەر بەو زاتە بکەین .

لەکاتێکدا مـن وام دەزانـی هاوڕێکـەم لـە ژێـر قورسـایی ناڕەحەتیەکاندا سکاڵا بکات‌و، لەبەر خێزانەکەی ڕەخنە لـە دەوڵـەت بگرێت، لەبەر نەخۆشی کچەکەی خەمەکانی دەربڕێـت، مانـدووبوون و شەکەتی ئاشکرا بکات. بەڕێز د. شەفیق بـەو هەڵسـوکەوتەی منـی شەرمەزار کرد و دەرسێکی وردی دادام.

لەبەرئەوەی لەگەڵ خۆیدا ڕابردوویـەکمان هـەبوو، دوای ماوەیـەك لەنێو قسەکانماندا پرسی:

– ئایا تۆ لە خەون تێدەگەیت؟

– وتم: نەخێر، کەسێك خەون بە ڕاست و دروستی نەبینێت چۆن لە خەون تێدەگات؟

پێکەوە پێکەنین...

بـەڵام ئـەو دەیویسـت خـەونێکی ڕاسـتیم بـۆ بگێڕێتـەوە، کـاتێ هەستم بەمە کرد وتم:

– ناتوانم لە مانـای خـەون تێبگـەم، بـەڵام گـوێ دەگـرم. ویسـتم لەسەر قسەکانی بەردەوام بێت.

بەڕێز د. شەفیق، کەمێك بێ دەنگ بـوو. چـاوەکانی بـۆ سـەرەوە بـەرز کـردەوە، بـۆ ئـەوەی فرمێسـکەکانی دەرنـەخات کـە لـە

ڕوانینەکانیدا یاریان دەکرد، بۆ ماوەیەك چاوەکانی داخست، بەڵام نەیتوانی ڕێگە لەو فرمێسکانە بگرێن کە بەسەر ڕوومەتەکانیدا تکان.

بۆئەوەی بەڕێز د. شەفیق ئەو ناڕەحەتییەی خۆی لە بیربکات و زیاتر هەستی گەرم نەبێت وتم:

– خێرە إن شاالله.

ئەویش بە دەنگێکی نوساو و خەمناکەوە وتی:

– إن شاالله.

کاتێ پێداگریم کرد کە ئەو بابەتە باس بکات، دەستیکرد بە باسکردنی:

هەرجارێك بڕۆیشتمایە بۆ ئەنقەرە، دەچووم بۆ مزگەوتی حاجی بایرام. لەوێ نوێژم دەکرد. ئەوەبوو شەوێك لە خەونمدا لە مزگەوتی حاجی بایرام نوێژم دەکرد، کاتێ نوێژ تەواو بوو جوولەیەك ڕوویدا. یەکێك وتی: برایان "بەڕێز حەزرەتی عەلی " لێرەیە، ڕاست ڕۆیشت بۆ لای میحراب. منیش دەستمکرد بە ڕۆیشتن. لەبەردەم میحرابدا زاتێك هەستایە سەر پێ کەسێکی باڵا بەرز، ڕیش سپی، زۆر نوورانی و ڕووگەش، ڕاست بەرەو قەرەباڵغییەکە ڕۆیشت بانگیکرد وتی:

– ڕاوەستن.

ڕووخسار و چاوەکانی ئەو زاتە تیشکیان دەدایەوەو، چاوەکانی ئێمەی ڕادەکێشا، بە ڕەحمەت بەرامبەر ئەو زاتە دەمانڕوانی وتی:

– براکانم، من ئیمامی عەلیم، هاتووم سەردانی ئێوە بکەم. کاتم کەمە، ناتوانم بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ قسەتان لەگەڵ بکەم.. تەنها ئەگەر هەرکەسێکتان پرسیاری هەیە با بپرسێت وەڵامی دەدەمەوە.

لە پێشدا لە کۆمەڵەکەدا دوو دڵییەك دروست بوو. پێش ئەوەی لە هیچ کەسێکەوە جووڵەیەك بکرێت، من خۆم هەڵدایە پێشەوەو، دەستمکرد بە پرسیار کردن وتم:

– قوربان، کۆمەڵێك هەن لە ڕێگای ئێوە لایان داوە، پێیان دەڵێن "عەلەوییەکان". چی بەمانە دەڵێیت؟

ئەو سیما نوورانییە بە جارێك گرژبوو، بە تووڕەییەوە وتی:

– ڕێگاکەی ئێمە، ڕێگای خوداو پێغەمبەرە ﷺ هەرکەسێك لەسەر ئەم ڕێبازە بڕوات ئەوا پێکەوەین، ئەوانەیشی کە پەیڕەوی ئەم ڕێبازە ناکەن ئەوا لە خۆڕایی خۆیان لە ئێمە ئەژمار دەکەن، ئەگەر ئەو کەسانە خۆیان لە ئێمەش ئەژمار بکەن، ئەوا ئێمە لەوان نین .

– باشە قوربان، هۆکاری پارچە پارچە بوونی موسوڵمانان و سەرنەکەوتنیان چییە لە دواڕۆژدا؟ پێویستە چی بکرێت بۆ سەرکەوتن؟

کەمێك ئاسودەتر وەڵامی ئەم پرسیارەی دایەوە و وتی:

– موسوڵمانەکان بە ناوبانگی ڕابردوویان هەڵخەڵەتان و، شانازیان پێوە کردو، سەرەنجام تەمەڵییان نواندو ئامادەکارییان بۆ داهاتوو نەکرد. ئەهلی کوفریش بۆئەوەی لە تێکشکاندن لە بەرامبەر

ئیسلامدا ڕزگاریـان بێـت زۆر تیکۆشـانو، سـەرەنجام سـەرکەوتوو بوون .

لەبەرئـەوە پێویسـتە موسـوڵمانەکان بـە هەڵسـوکەوتی ئیجـابی ڕێگـای ئاشـتی هەڵبـژێرن و بـە شـوێن ڕێگـای هاودەنگیـدا بگـەڕێن، چونکە ئەوانەی ڕێککەوتن دەکەن شـیاوترینن بـۆ نوێنەرایەتیکردنی ئەهلی ڕاستی.

مەهێڵن ئەهلی کوفر دووبەرەکی بخەنە نێوانتـان. تێگەیشـتووبن. با خاڵی بینینتان قورئـان و ئیمـان بێـت، بـۆ ئـەوەی کـۆك و تـەبابن پێکەوە. خۆ ئەگەر خاڵی بینینتان ببێتە سیاسەت ئـەوا دووبـەرەکی دەکەوێتە نێوانتان.

یەکێکیش لە کۆمەڵەکەدا پرسیارێکی کرد:

– قوربان، پەیوەست بە داهاتوومانەوە ئومێد هەیە؟

حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بـە شـێوەیەکی زۆر سـەرنج ڕاکێش وەڵامی دایەوە :

– بەڵێ، ئومێدتان هەیە. لە داهاتوودا بـەهێزترین دەنـگ دەنگـی قورئان دەبێت. لە داهاتوودا ئیمان و قورئان فەرمانڕەوایی دەکەن.

پرسیارێکم سەبارەت بە ڕۆڵی موسـوڵمانان ئامـادەکردبوو کـە لـە کتێبـی وتـاری شـامی نـاوداری بـەدیعوززەمان سـەعید نورسیشـدا باسکراوە، پێش ئـەوەی مـن بپرسـم حـەزرەتی عـەلی (ڕەزای خـوای لێبێت) وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ، سەبارەت بە ڕۆڵە مەعنەوییەکەمان زانای گەورە بەدیعوززەمانی بەڕێزیش باسی کردووە. بێگومان ڕاستەقینەی وتووە، دروستی وتووە. ئەگەر موسوڵمانان سەرقاڵی دونیای ماددی بن و داڵغەیان هەر لای دونیا بێت، ئەوا دووبەرەکی دەکەوێتە نێوانیان و، ئەرکە سەرەکیەکانیان لەبیردەکەن و، ئەهلی کوفریش دڵخۆش دەبن، سەرەنجام خوای پەروەردگاریش تەمەنیان لە دونیادا کورت دەکاتەوەو، لە ڕۆژی دواییدا لە جێگەی سەردەمی قورئان، سەردەمی زوڵم دەهێنێت. بەرپرسی ئەمەش ئەو موسوڵمانانەن کە لەو سەردەمەدا دەژین.

- لە ڕۆژی دواییدا موسوڵمانەکان لێپرسراوی چین؟

سەروەرمان بۆ ئەم پرسیارە، هێواش هێواش بە دووبارە کردنەوەوە وەلامی دایەوە:

- بە لە ئامێزگرتنی قورئان... بە جێبەجێکردنی پەرستشەکان... بە نەهێشتنی دووبەرەکی... بە هەڵسوکەوتی ئیجابی.... بە ئاشتیو... بە پەروەردەکردنی موسوڵمانانەی ڕۆڵەی موسوڵمانان...

پرسیاری تریش کران، بەلام لەبەر جۆش وخرۆشی ئەو خەونە و لێڵی هەندێکیشی نەمتوانی بە تەواوی وەلامەکانیم دەستبکەوێت .

کە بە خەبەرهاتم، لە بارودۆخێکی سەیردا بووم .

بەڵێ، بەڕاستی خەونێکی سەرسوڕهێنەر بوو... بوو بە نـاوەڕۆکی بابەتـەکانی ئـەمڕۆمان، بـوو بـە ئاگادارکردنـەوە و ورياکردنـەوە... لەڕاستيدا ئەم پەيامانە هێنـدە گرنگن کـە دەبنـە بنـەمای سـەرەکی لەژيانی تاك و کۆمەڵدا... باشترين ڕێگای ڕزگاربوونن بۆ مرۆڤەکان.

هەڵبــەت لــە ڕوانگــەی ئــايينی پــيرۆزی ئيســلامەوە مــرۆڤ بەديهێنراوێکی بەڕێزەو پێويستە ژيـانێکی شايسـتە بـژی کـە لەسـەر بنەمای کاروکردەوەی چاك و هەڵوێستی ئيجابی بنيات نرابێت.

پێويستە مرۆڤ ئەوە بزانێت کە لە دونيادا ئەرکی چييەو.. گرنگـی بە زانست و ئيمـان بـدات و.. خـودی خـۆی ڕێکبخـات و.. سـوود بـە دەوروبەرەکەی بگەيەنێت... پێويستە نەوەکانی بە باشـترين شـێواز پــەروەردەبکرێن، خــەڵکی لــە ژيــانی ســەردەميانەو تايبەتمەندييــە ســەرەکيەکانی تێبگـەن و بەشـێوەيەکی تەندروسـت مامەڵـە لەگـەڵ گۆڕانکاريەکاندا بکەن.

هەرچەندە سەردانەکەم بۆ لای د. شەفيق بەمەبەستی دڵدانـەوەی بوو، بەڵام من گەورەترين دڵدانەوەم لەوەوە دەستکەوت.

بەڕاسـتی سـەرکەوتنی ئـەو مرۆڤـە بـەڕێزە لـەکارو پيشـەکەيداو، جيهانی پاك و بێگـەردی ناخيشـی بـيرو هزريـان واڵا کـردم، جيهـانی نــاخی ئەوەنــدە نــوورانيی و ڕوونــاك و پــڕ نييــەتی پــاك بــوو کــە خەونەکەی باشترين سەلماندنی ئەمەبوو.

بەڵێ ئەو د. شەفیقەی کە لەلایەکەوە سەرقاڵی خزمەتکردن بوو لەبواری پیشەکەیداو، لەلایەکی دیکەشەوە گرفتاربوو بەدەست تاقیکردنەوەیەکی قورسەوە لە ژیانیدا، ئەمڕۆ خەریکە ژیانێکی سادە دەژی. بۆئەوەی بتوانم ئەم بیرەوەرییەی بنووسمەوە لەسەردانەکەمدا مۆڵەتم لە خۆی وەرگرت، ئەویش لە وەڵامدا وتی:

– بە گۆڕینی ناوم دەتوانیت بینووسیتەوە.

منیش هەر وام کرد، ناوێکی خوازراوی وەك بەڕێز (د. شەفیق)م بەکارهێنا.

بیرەوەری بەڕێز د. شەفیق لێرەدا تەواو نەبوو .

کچە چواردە ساڵەکەی (نوورییە) کە نەخۆشی جگەری هەبوو لە کاتی کۆچ کردنیدا ڕووداوێکی سەیری بەسەرهاتبوو.

نوورییە ڕۆژێك پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات، بارودۆخێکی لەم شێوەیە بۆ باوکی باس دەکات:

– باوکە، ئەمڕۆ لە کاتی نیوەڕۆدا، تەلەفۆن لێیدا، منیش هەڵمگرت. لە تەلەفۆنەکەدا دەنگێکم بیست وەك بڵێی دەنگێکی ئەفسووناوی کە زۆر کاری تێکردم، زۆر جیاوازبوو. پیاوێك بە دەنگێکی گڕ و شیرین پێی وتم:

– کچم خۆت ئامادە بکە، سبەینێ دەتبەین بۆ گەشت.

– وتم: چ گەشتێك، من ناتوانم لە جێگاکەم بەرزببمەوە.

– سبەینێ زۆر باش دەبیت، تەنانەت ئاسەواری نەخۆشییەکەت نامێنێت. دەتبەین و دەتگێڕین، بۆ شوێنی وەهات دەگێڕین کە زۆر خۆشحاڵ دەبیت .

– باشە ئێوە کێن؟ ئایا باوکم ئاگادارە لەم گەشتە؟

– ئێمە هاوەڵی سەروەرمان (حەزرەتی عەلی)ین (ڕەزای خوای لێبێت)، سبەینێ (ڕۆژی هەینی) لە کاتژمێر ۱۲:۰۰ دا هەواڵ بە باوکیشت دەدەین .

هەم بەڕێز شەفیق و هاوسەرەکەی، هەم نورییە تێدەگەن کە قسەکانی ئەم پەیوەندیە تەلەفۆنیە پڕە لە نهێنی. هاوکات نوورییە خانم بە باوکی دەڵێت: "پێدەچێ سبەینێ من بمرم".

پاش ڕۆژێک واتە ڕۆژی هەینی لە کاتژمێر ۱۲:۰۰ دا نەخۆشییەکەی نوورییە خانم قورس ببوو، سەری کچەکە لەسەر کۆشی بەڕێز شەفیق بوو، دایک و باوک سورەتی یاسینیان بۆ کچەکەیان دەخوێند، کچەکەش هاوڕێیەتی دەکردن، لە پڕێکدا چاوەکانی نوورییە گەشانەوەو وتی:

– باوکە هاتن.

بەڕێز شەفیق وتی:

– کێ کچم؟

– هاوەڵەکانی سەروەرمان عەلی (ڕەزای خوای لێبێت)... چەندە مرۆڤی ڕووخۆش و شیرینن... دەمبەن بۆ گەشت...

بەڕێز شەفیق و خێزانەکەی ناتوانن کەس لەو دەوروپشتەدا ببینن، بەڵام هیچ گومانیان نییە لەوەی کە ئەوانەی هاتوون فریشتەن و بۆ دوایین کار هاتوون.

نوورییە خانم کە خوێنەری ژیانی حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بوو، سەرسام بوو بە تێکۆشان و خزمەتەکانی، بەردەوام وردەکاری ژیانی حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) و پەیامەکانی دەخوێندەوە، بۆیە لە کۆتا هەناسەیدا چووبوویە چاودێری مەعنەوی حەزرەتی عەلییەوە (ڕەزای خوای لێبێت) بەم شێوەیە کۆتا هەناسەی دابوو.

هاوڕێی ڕێزدارم کاک شەفیق بە خۆشی و سرورەوە ئەو ڕووداوانەی دەگێڕایەوەو دەیوت:

سوپاس بۆ خوا، کچەکەم وەك شەهیدێکی مەعنەوی بەئیمانەوە ڕۆیشت، گەورەترین سەرمایەی پێویستی بەدەست هێنا.

ئەو زۆر ڕاست بوو. گەورەترین سەرمایەی مرۆڤ ئەوەیە کە بە ئیمانەوە بچێتە ناو گۆڕ و، ژیانی هەتا هەتایی بەدەست بهێنێت.

خوای پەروەردگار بیکاتە قسمەتی هەمووومان. ئامین

# زافەری سەرفراز

لەبەر "ڕۆژی واژوو" چووم بۆ پارێزگایەکی بەناوبانگی پیشەسازی ئەنادۆڵ. ئەو ڕۆژە لەگەڵ نوێنەری دەزگایەکی پیشەسازیدا باسمان لە بەرنامەکەی دەکرد وتی:

– مامۆستا، پێش ئەوەی بیرم بچێتەوە با پێت بڵێم؛ ئەمڕۆ بۆ نانی ئێوارە بانگهێشتی لە ناکاو کراوین بۆ ماڵێك.

بە پەرۆشەوە پرسیم: بۆ کوێ؟

– پیاوێك بیستبووی کە ئێوە دێن، پێش دوو ڕۆژ هات بۆ لای ئێمە. وتی:"بۆ نانی ئێوارە بەڵێن بە هیچ شوێنێك مەدەن، من میوانداری مامۆستا دەکەم".

کە پێداگریم کردو وتم:"ئەو پیاوە کێیە؟" ناوی نەوت، وتی:

– مامۆستا سەرسام دەکەم، ئەوەندە بەسە کە بزانێت قوتابییەکی پێشوویيم.

هەم خەمم دەخوارد و هەم دڵخۆشبووم.

لەڕاستیدا هەموو مامۆستایەکی دڵسۆز بە هەواڵی پێگەیشتنی قوتابیەکەی و میوانداریيەکەی زۆر دڵخۆش دەبێت، چونکە قوتابی بۆ مامۆستا وەك تاکێکی خێزانەکەی وەهایە، بە هەواڵێکی خۆشی قوتابییەکەی هەست بە خۆشیەکی زۆر دەکات و، بەهۆی باری نیگەرانبوونیشیەوە، هەست بە ئازارێکی قووڵ دەکات، ئەمە سۆزێکی زۆر سەیرە، تەنها مامۆستا دەتوانێت لێی تێبگات .

بە نزیك بوونەوەی کاتی ئێوارە، بەردەوام چاوم لە دەرگاکەبوو بۆ بینینی قوتابیەکەم کە پێش وەخت حەزم دەکرد بزانم کێیە .

پاش کەمێك ئۆتۆمبێلێکی کەشخە لە دەرگاکە نزیك بووەوە، گەنجێکی بالاّ بەرزو ، ڕووگەش و چاویلکە لە چاو لە ئوتومبیلەکە دابەزی. کاتێك ئەو گەنجە دەم بەخەندەو سەرنجڕاکێشە لێم نزیك دەبووەوە، پێشبینیم کرد هاونیشتمانێك بێت و هاتبێت تا یەکتری بناسین و کتێبی بۆ واژوو بکەم، چونکە گومانم هەبوو لەوەی کە ئەو قوتابیەی چاوەڕێم دەکرد خاوەنی ئوتومبیلێکی ئاوا کەشخە بێت.

کە لێم نزیك بووەوە زەردەخەنەکەشی زیادی کرد، بە هەڵوێستەکانیدا وام هەستکرد کەسێکی نزیك بێت.

بریسکەی چاوەکانی کاری لە ناخم کرد، تەوژمێکی جۆش و خرۆش هات و هەموو لاشەمی داپۆشی .

– مامۆستا، دەستت ماچ دەکەم، من زافەرم، خوێندکارەکەی کۆلێژتان، لە یەك ساتدا مێشکی ماندوو و هیلاکم هاتەوە سەرخۆو

ئەو خوێندکارەی بیرهاتەوە. لەگەڵ ئەو خوێندکارەمدا کە ناخۆشی زۆری چەشتبوو، جێگەیەکی تایبەتی لە دڵمدا هەبوو باوەشمان کرد بەیەکتردا.

– ئاه زافەر گیان تۆی! چۆن ناتناسم. کەم منت گریاند؟ کەم لەبەر تۆ خەوم لێ زڕا؟ کەم بۆت پاڕامەوە؟ تۆ بەم بەژنە جوان و ئۆتۆمبێلە کەشخەیەوە هاتوویت میوانداریم بکەیت ها!

خوایە گیان، تۆ چەندە مەزنی. زافەری خوێندکارم بێ پوڵ و پارە، بێ کەس، نا ئومێد، ژیانێکی سەختی گوزەراند... ئێستا تۆ ئەو زافەرەیت وا نییە ؟

دووبارە لە ئامێزم گرت، کەسمان نەمانتوانی بەربەستی ئەو خەمە بین کە لە چاوەکانمانەوە دەڕژا، بەشێکی بۆ ناخمان، بەشێکیشی لە ڕوومەتمانەوە تا چەناگەمان تکا ؟

ئاه زافەرە بەدبەختەکەم... ئاگادارم کە چەند ساڵ پێش ئێستا لەدەست چووبوو، لەگەڵ ناخۆشی و ئازاردا دەژیا.

هەوەڵ ڕۆژم بەبیردێت کە هات بۆ قوتابخانە. زۆر لاوازو بێ هێز بوو، لەخۆیدا نقوم ببوو، لە بارودۆخێکی ناهەمواردا بوو وەك ئەوەی بارێك لەسەر شانەکانی بێت و نەتوانێت هەڵیبگرێت ماندوو بوو وتی:

من زافەرم، خەڵکی یۆزگاتم. سێ براین، من گەورەترینیانم. کاتێ تەمەنم دە ساڵان بوو دایکم کۆچی دوایی کرد. باوکیشم ئاسنگەر

بوو، لەسەر بینا کەوتە خوارەوە، لە ناوقەدی بۆ خوارەوە ئیش ناکات، لە ماڵەوە لە جێگادا کەوتووە .

بۆ ئەوەی دڵنەوایی ئەو قوتابییە خەمبارەم بدەمەوە قسەکانیم تاقی کردەوە، پرسیم:

– باشە کێ ئاگاداری باوکت دەبێت؟

وتی:

– مامۆستا باوکم تەنها کێشە نییە. خوشکێکم هەیە تەمەنی دوانزە ساڵانە، نەخۆشی گورچیلەی هەیە، ئەگەر چارەسەر نەکرێت، کۆتایی باش نابێت... ئەویش لە جێگادا کەوتووە.

– کەسی ترت نییە؟

– برایەکم هەیە دوو ساڵ لە من بچوکترە، هەرچەندە زۆر زیرەك بوو بەڵام وازی لە قوتابخانە هێنا، واتە خۆی کردە قوربانی من لە لای بەرگدروویەك کار دەکات .

زافەر لەوە زیاتر خۆی بۆ ڕانەگیراو قسەکانی بڕی، هەنسکە هەنسکی ناخی هەموو قوتابییەکانی هەژاند.

هەرچەندە زۆرم لەخۆم کرد بۆ ئەوەی نەگریم، بەڵام نەمتوانی سەرکەوتووبم. لەگەڵ قوتابییەکانمدا بۆ ئەو ئازارە بەسۆیەی زافەری قارەمان دەستمانکرد بە گریان.

زافەر لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو وتی:

– چــی بکــەم، بــەزۆر نــاردمی، نەمدەویســت بــێم. دەمویســت چــاودێری بــاوکم و خوشــکەکەم بکــەم، بــەڵام نــەمتوانی بــاوکم ڕازی بکەم. باوکم پێی وتم:"گەردنت ئازاد ناکەم"، وتی:" نـاتوانم لـەخۆم ببورم کە تۆ بەهۆی ئێمـەوە بـێ چـارە بیـت، ئێمـە مـردووین، بـەڵام پێویستە تۆ بژیت". زۆر پاڕامەوە، بـەڵام نـەمتوانی ڕازی بکـەم. مـن ئێستا دەتـوانم چـی بکـەم، کـاتێ ئـەوان لـەوێ لەگـەڵ مردنـدا شـەڕ بکەن، من چۆن بتوانم لێرە بخوێنم؟

بەڵێ، هاواری زافـەر هێنـدە بـە ئـازارو سـوتێنەر بـوو، بێجگـە لـە پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار و داواکردنی یارمەتی لێـی چـارەیەکی ترمان نەبوو .

لـە پشـووی نیـوەڕۆدا بـانگم کـردە ژوورەکەمـەوە، بـە نیـازبووم قسەی لەگەڵ بکەم و دڵشادی بکەم، کـە قسـەمانکرد باسـی ئـەوەی کرد کە کێشەکەی تەنها نەخۆشی باوك و خوشـکەکەی نییـە، بـەڵکو زۆریش هەژار و بێ پارەیە .

خانوویان نەبوو، لە خانووی کرێدا نیشـتەجێ بـوون. براکـەی کـە لای بەرگـدروو ئیشـی دەکـرد، ئـەو پارەیـەی وەری دەگـرت بەتـەنها بەشی کرێ خانووەکەی دەکرد. بۆ دابینکردنی خواردن و داودەرمان و پێداویســتییەکانی دیکــەش چــاوەڕێی دەســتی کەســانی خێرخوازبوون.

هەرچەند نەدەكرا هەموو كێشەكانی زافەر چارەسەربكرێن، بەڵام هیچ نەبێت پێویست بوو كە لەلای بین و ئاگاداری بین.

بۆئەوەی زافەر كەمێك هەستێتەوە سەرپێ، لەگەڵ قوتابییە فیداكارەكانمدا پشتمان گرت، پلانێكمان دانا .

باوكی قوتابییەكم دەوڵەمەند بوو، كرێی ئەو خانووەی گرتە ئەستۆ كە خێزانی زافەری تێدا نیشتەجێبوون. هاورێیەكی زۆر بەرێزیشم كە خاوەنی نەخۆشخانەیەكی تایبەتی بوو ئەركی تیماركردنی باوكی و خوشكەكەی خستە سەر خۆی .

قوتابیانی پۆلەكە بە جارێك هاتن، خەرجی زافەریان دابینكردو، هەموو ئەمانە لە ماوەی یەك دوو مانگدا هاتنە دی.

زافەر هەم قوتابییەكی زۆر زیرەكی پۆلەكەو، هەم خاوێن و، رێك و پێك و تێكۆشەر بوو...

زۆر خۆشحاڵ بووین لەبەر ئەوەی كە كارەكانی زافەرمان خستە سەر رێگای خۆی، بەڵام چەند رۆژێك لە پێش تاقیكردنەوەی كۆتایی ساڵدا هەواڵی كۆچی دوایی باوكی پێگەیشت، زۆری نەبرد خوشكەكەشی كۆچی دوایی كرد.

زافەر جارێكی تر بەهۆی ئەم ئازارانەوە رووخا، بەڵام هاورێكانی ئەویان بە تەنها جێنەهێشت، لە هەموو جارێكدا دەبوونە پاڵپشتی، نموونەی پشتیوانییەكی ماددی و مەعنەوی جوان بوون.

من بەهۆی پێویستی کارەکەم چوومە پارێزگایەکی تر، لەگەڵ زافەردا پەیوەندی تەلەفۆنیمان بەردەوام بوو، تا دواجار توانای خۆ بەڕێوەبردن و، وزە و متمانە بەخۆبوونی بەدەستهێنا.

نزیکەی شەش ساڵە لەگەڵ زافەردا نەمانتوانییوە چاومان بە یەکتر بکەوێت. بانگهێشتی کردم بۆ یەکەم دەستپێکی کارەکەی نەمتوانی بچم، پێش دوو ساڵ ئاهەنگی هاوسەرگیری هەبوو نەمتوانی بەشداری لەوەشدا بکەم.

ئەوەتا ئێستا ئەو زافەرە میوانداری کردووین...

بەیەکەوە چووینە ماڵەکەیەوە...

کە تەواو بووین لەو سفرە و خوانەی کە هاوسەرەکەی ڕازاندبوویەوە، توانیم گوێ بیستی بەشێکیش لە ژیانی بم کە لە پاش من تیایدا ژیاوە.

ئەو برایەی کە لەلای بەرگدروو کاری دەکرد، دەستی کردبوو بە بازرگانی کردن بە پۆشاکی ئامادەکراوەو گەیشتبوو بە ژیانێکی ڕێك و پێك... زافەریش لەگەڵ کچی بنەماڵەیەکی دەوڵەمەنددا هاوسەرگیری کردبوو، بەشێکی ژیانی کردبووە قوربانی بۆ هەژاریی .

ئیتر ئەویش مامۆستا بوو، تێدەکۆشا بۆ ڕزگارکردنی زافەرەکانی دیکە.

پاش ئەوەی بەیەکەوە نوێژمان کرد، ئەو تابلۆیەی نیشاندام کە بە دیوارەکەوە هەڵیواسیبوو وتی:

– مامۆستا، ئەو وتەیەم لەبەر کردووە کە پشتیوانم بووە و توانای پێ بەخشیووم .

" ئەوەی زاتی (الله) بناسێت و گوێ ڕایەڵی بکات گەر لە بەندیخانەشدا بێت بەختیارە، ئەوەی لە بیری بکات لە کۆشکیشدا بێت لە بەندیخانەدایەو چارە ڕەشە". (وتەکان)

ناخۆشییەکانی ژیانی، ئیمان و باوەڕی پتەوی بە خوای پەروەردگار بێ هیوانەبوون و سنگ فراوانیەکەی، ماڵە خۆش و دڵگیرەکەی، هەموو ئەمانە سەرلەنوێ جۆش و خرۆشیان خستەوە دڵە ماندووەکەمەوە و پڕیان کرد لە خۆشی، چونکە قوتابی بەشێکە لە ژیانی مامۆستا، پێویستە بەو شێوەیەش بێت. خوای پەروەردگار ئێمە شایستە بکات بۆ قوتابییەکانمان، ئەوانیش بۆ بەدیهێنەرەکەیان .

## چیرۆکی ژیانی

# قوربانییەکی دەستی هیرۆین



چیرۆکی ژیانی کچێکی گەنجی بێبەش لە ئامێزی گەرمی خێزان، بێزار بوو لە شەڕی دایك و باوك، مەحروم لە ژیانێکی شایستە. کە ژیانی گەنجێتی لەژێر کاریگەری خراپی ماددە هۆشبەرەکان و خووە نامۆو زیانبەخشەکاندا بەسەر برد.

ئەو ژیانەی کە بە ئومێدەوە دەستی پێکردو، بە ناخۆشی ساڵانی گوزەراو، بە خۆکوشتن کۆتایی هات...

ئەم چیرۆکە پێشکەشە بەوانەی کە خەمی منداڵەکانیانەو، ئامادەن پەند لە ئەزموون و بەسەرهاتی کەسانی دەوروبەریان وەربگرن.

ناو، کانات گیونێر.. لە ساڵی ١٩٧٠ دا لە (موش) لە دایکبووە. لەبەر بیروبۆچوونی سۆشیالیستیانەی باوکی ژیانی منداڵیی لە شارە جیاوازەکانی ئەنادۆڵ بەسەر بردووە.

چووەتە کۆلێجی پزیشکی زانکۆی جەراح پاشای ئیستەنبوڵ. لە ماوەی (٨)ساڵدا بە زەحمەت توانیویەتی تا پۆلی (٤) بخوێنێت و، دواجار بەهۆی دەروونی وێڵ‌و بیر و خەیاڵی پەرش و بڵاوو، دەورەبەرە زیانبەخشەکەیەوە کەوتۆتە تەڵەی هیرۆینەوەو، نەیتوانیوە درێژە بەژیانی ئاسایی بدات.

لە گێڕانەوەی چیرۆکی ئەم ژیانە پڕ پەند و ئازارەدا، ئاماژە بەو تێبینییانە دەکەین کە ئەم گەنجە ماوەیەکی کورت پێش خۆکوشتن نووسیونی:

سرنجم گرت بە دەستەوە، بە جۆرێك کەوتمە گۆبەندەوە کە زۆر دێرین بوو، دەبوو هیچ شتێك لە دوای خۆم بەجێنەهێڵم، بیرم لەوە کردەوە کە بە لایەنی کەمەوە هۆکاری خۆکوشتنەکەم بزانن؛ لە ڕاستیدا قەرزاری کەس نیم، دوژمنایەتیشم لەگەڵ هیچ کەسێکدا نیە، تەنها دەمەوێت پەیامێکی گرنگ بگەیەنم، کە ئامانجی سەدان ساڵی هەبێت. وەك ئەو سیگناڵانەی دەنێردرێنە بۆشایی ئاسمان کە سەدەها ساڵی تیشکیی دوورە.

کاتێ بیر دەکەمەوە چی بنووسم نامەوێت پیربم و بە ئەجەلی خۆم بمرم، بەڵام ناشزانم چۆن دەست پێبکەم، بۆ نموونە ئەگەر بەم شێوەیە دەست پێبکەم: خەڵکینە، من بڕیاری خۆکوشتنم داوە، دەزانن بۆچی؟ چونکە تا ٢٧ ساڵ بەرگەی ئەم ئازارانەم گرت، ئەوانەشی وەك منن پێویست ناکات لەوە زیاتر بژین. خۆیشم نازانم

دەڵێم چی ئەی ئەگەر لەجیاتی خۆکوشتن بڕیاری مانەوەم بدایە بۆ ئەوەی نەوەم هەبێت! گرنگ نییە کە هێشتا ژیری لە مێشکمدایە، ئەو شوێنەی کە پێویستە بۆ چوونە سەر شانۆ دابینم نەکرد، بەڵام ئەو شوێنە دەزانم کە پێویستە لێوەی دەربچم. زۆر باش ئاگاداری خۆتان بن، دوور بن لە خوو ڕەوشتە خراپەکان.

کەسێك شك نابەم تا پێویست بکات ژیانمی لە پێناودا بکەمە قوربانی، پێویستیش ناکات هۆکاری خۆکوشتنم بزانن، هەروا چەند دێڕێك ڕەش دەکەمەوە.

" تەنها دەمەوێت چەند شتێك بۆ بنەماڵەکەم کە بەهۆی منەوە تیاچوون و پەکیان کەوت، ڕوون بکەمەوە.

هەموو ئەو شتانەم کرد کە لە من چاوەڕوان نەدەکرا، زۆر شەرمەزارم کردن، چونکە ئەوان بەو جۆرە منیان پێ گەیاند کە دەوروبەر بڵێن:"ئەها چ منداڵێکی باشتان پەروەردە کردووە". بەتایبەتی دایکم...

بەگشتی نەمدەتوانی زۆر چاوم بە دایکم بکەوێت، ئەو دایکێکی تێکۆشەر بوو. وەك دایکی منداڵەکانی دیکە لەماڵەوە دانەدەنیشت خواردن ئامادە بکات و، خۆی فێری چنین بکات. پێویست بوو کار بکات. هەمیشە گلەیی دەکرد، بەڵام لە ڕاستیدا کارەکەی زۆر خۆشدەویست. لولە خوێنەکانی قاچی فراوان بووبوون. گزنگی بەیانیان دەڕۆیشت، تاریکی ئێوارە دەهاتەوە. ئێمەی لەگەڵ لادێییە

نەخوێندەوارەکاندا گەورە کرد، کەسیانم خۆشنەدەویست، گاڵتەم پێدەکردن، لەگەڵیاندا ڕامدەکردە کۆڵان، یاریم لەگەڵ دەکردن. هەمیشە کۆڵانم لە ماڵ پێ باشتربوو.

کاتێ تەمەنم ١٠ ساڵان بوو سەری پووچی تێهەڵدراوم بەخەمی ماڵ و وڵات جەنجاڵ بوو بوو. چوونە کۆڵان قەدەغە بوو، چونکە ئەفسەر و پۆلیسی لێبوو، باوکم و دایکم لە یەکتری جیابووبوونەوە. ئەو ساڵە گواستبوومانەوە بۆ ئەو شارە بچوکەی ئەنادۆڵ، کە دایکم و باوکمی تیادا لە دایك بووبوون و پێگەیشتبوون، هەروەها دایکی دایکم و دایکی باوکمی تیادا ژیابوون. ئیتر نیوەی ئەو شارە خۆیان لە شەڕی دایکم و باوکم هەڵدەقورتاند، ژەهری پرتە و بۆڵەیەکی نائاسایی تێکەڵ بە ژیانمان بوو بوو.

شار بووبووە دوو بەشەوە : لایەنێك پاڵپشتی دایکمی دەکرد، لایەنێکیش پاڵپشتی باوکمی دەکرد. من لە لایەنگری دایکم مامەوە. یەك ڕۆژ دوای ئەوەی کە دایکم دەستی من و براکەمی گرت و ڕفاندنیی بۆ ماڵی نەنکم، چووین بۆ هێنانی کەل و پەلەکانمان. باوکم لەسەر ئیش بوو، ئەو جگەرانەی کە شەو کێشابوونی لە تەپلەکی جگەرەکەدا دێوئاسا مۆلکیان دروستکردبوو، کە بارودۆخی ئەوم هێنایە پێش چاوی خۆم، تەوژمی ئازارێکی زۆر گەورە بەگیانمدا تێپەڕی. باوکم زۆر خۆشدەویست، بەڵام بەهۆی کاریگەریی دایکم و دەوروبەرەکەیەوە حەزم دەکرد لە یەکتری جیا ببنەوە. دایکم

گرنگــی تایبــەتی بــە مــن دەدا، چــونکە دادوەر وتــەی منیشــی وەردەگرت. براکەم زۆر بچوك بوو" هەستی بە هیچ شتێك نـەدەکرد، لە پێشدا ئەویش لایەنگری دایکم بـوو. پاشـان بـیرم نایەتـەوە چۆن بوو، دەستی کرد بە مانەوە لـە مـاڵی نـەنکم (دایکـی بـاوکم) لەگـەڵ باوکمدا، بیرم دێت ڕۆژێـك لـە ناوەنـدی شـارەکە براکـەم قـۆڵێکی بـە دەست دایکمەوە بوو، قۆڵەکەی تریشـی بـە دەسـت باوکمـەوە بـوو، ڕایان دەکێشاو هاواریان بەسەر یەکتردا دەکرد.

ماوەیەك دوای ئەم ڕووداوە باوکمیان ڕازی کرد کە واز لـە براکـەم بهێنێت. نەگبەتە بۆ ئەوەی خێزانەکەی بتوانن بە یـەك شـاد ببنـەوە بــە هــەموو شــتێك ڕازی بـوو. کـاتێ دادگـایی بەڕێوەچـوو، دادوەر پرسیاری لێکردم کە چی بووە، منیش ئـەو قسـانەم کـرد کـە پێیـان لەبەر کردبووم:"باوکم مەی دەخواتەوەو، چاودێریمان ناکات، خـراپ لەگــەڵ دایکــم هەڵســوکەوت دەکــات."پارێزەرەکــەی بــاوکم بــە دادوەرەکـەی وت: "ئـەو هێشـتا منداڵـە لەوانەیـە ئـەم قسـانەیان فێرکردبێت". منیش دەستبەجێ بەتوڕەییەوە وتم:"جەنابی دادوەر، ئایا مـن ئەوەنـدە منـداڵم کـە بتـوانن فریـوم بـدەن؟ ئەمانـە قسـەی خۆمن". دادوەرەکە زەردەخەنەیەکی کرد و بڕیاریـدا کـە یـەك سـاڵ بەجیا بمێنمەوە.

ئەو یەك ساڵە زۆر خـۆش بـوو، کۆتـایی هەفتـەکان بـاوکم ئێمـەی دەبـرد و هــەموو داخوازییـەکانمانی جێبـەجێ دەکـرد، تەنانـەت لـە

کۆتاییدا بوومە خاوەنی پاسکیل. لەم ماوەیەدا هەموو ڕۆژێك باوکم کەسێکی دەنارد بۆ لامان تا هەوڵی ئاشتبوونەوە بدات، لە کۆتاییدا دایکم نەیتوانی خۆی ڕابگرێت و، دووبارە بۆ ماوەیەك پێکهاتنەوە.

لە ڕاستیدا باوکمم زۆر خۆشدەویست، ئێستاش زۆرم خۆشدەوێت. یەکێك بوو لە زیرەکترین ئەو مرۆڤانەی کە دەمناسین. کەسێکی زۆر سەر ڕاست بوو، هاوڕێیەکی زۆر میهرەبان و گیانی بە گیانی بوو، زۆر خێرا قەناعەتی بە مرۆڤەکان دەکردو، زۆر خێراش دڵشکاویی دەڕەوییەوە. لە سایەی ئەو سەرڕاستییەیەوە لەو شار بۆ ئەو شار دەسوڕاینەوە. باوکم دزی نەدەکرد، هەر فەرمانبەرێکی دەوڵەتیش لەم وڵاتەدا دزی نەکردایە هیچ کەس خۆشی نەدەویست. پێش ١٢ ی ئەیلول، نیوە شەوێك پۆلیس دای بەسەر ماڵەکەماندا و باوکمیان دەستگیر کرد، کەسێك هەواڵی لێدابوو. بێگومان هیچ شتێکیان نەدۆزییەوە. لەوانەیە سۆشیالیست بووبێت بەڵام هیچ کاتێك نەبوو بوو بە کۆمۆنیست، بەدڵنیاییشەوە هەرگیز ڕازی نەبوو هیچ شتێك بەچەك چارەسەر بکرێت.

قۆناغی هەرزەکاریم بەوپەڕی ناهاوسەنگییەوە تێپەڕاند. هیچ شتێك لە پرتە و بۆڵەو چاوی ناوچەکەمان دەربازی نەدەبوو، چاو لە هیچ شتێکی عەیبە نەدەپۆشرا.

لەبەرئەوەی حەزم لە پاسکیل سواری بوو، گوێم بەوە نەدەدا کە بووم بە گەورەکچ و شەرمم نەدەکرد، کاتێك لە دوکانی میوەفرۆش

لەگەڵ چەقاوەسووەکانی گەڕەکدا شەڕە دەمم دەکرد باپیرم بەزۆر دەیبردمەوە بۆ ماڵەوەو دایکم لە گەرماوەکەدا لێیدەدام، بە دەنگێکی ناساز هاواری دەکرد: "دەبیتە سۆزانی؟" نەخێر، ئیازێکم نەبوو کە وەك سۆزانییەکم لێبێت، بەڵام هەموو خێزانەکە لەم ترسەدا دەژیا، منیش کتوپڕ ئەوانم تووشی سەرسامی کرد. چیم کرد؟ دەستم کرد بە نوێژ کردن! بە پانتۆڵێکی دڕاوەوە لە ناوەڕاستی پۆستەرەکاندا نوێژم دەکرد، هەر پێنج فەرزەکەم بەبێ کەموکوڕی دەکرد.

زۆر بێزاربووم لەو شارە نەفرەتییە. باشتر وابوو لە زانکۆ ڕامبکردایە، بەڵام لەلایەك بە کلتووری دایك و باوکەوە بەسترابوومەوە، لەلایەکی ترەوە ئەوانەی نەتەوەچیتیان دەکرد پێیان دەوتم سەرلێشێواو.

لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا دەستمکرد بە جگەرەکێشان. باوکیشم خۆشبێت! زۆر لەمێژبوو بە مەی ئاشنا بووبووم.

لەڕاستیدا سوپاسی دەکەم لەبەرئەوەی کە وتی بڕۆ بۆ ئیستەنبوڵ، پێی وتم: "ئاگاداربە ئێرە تاکسیمە، ئەوێ کادیکۆیە، بۆئەوەی لێرەوە تێبپەڕیت چاوەڕوانی وەستانی ئۆتۆمبێلەکان مەکە، تۆ تێبپەڕەو ئەوان دەوەستن". بۆ بەجێ هێشتنیشم سوپاسی دەکەم.

لە تەمەنی (١٧) ساڵیدا بووم، بە تەنها لە ئیستەنبوڵ بووم.

سەرم دەکرد بە هەموو کونێکدا. سەرەتاش لە پەناگە پەراوێز خراوەکانی کۆلێژەکانو، یانە کۆمەڵایەتییەکانی شۆڕشگێڕەکانەوە دەستمپێکرد ... خەڵکی لەو شوێنانەدا کاری داوێنپیسی و پڕ لە شەرمەزاریان ئەنجامدەدا. یەکەم خۆشەویستم لەوێدا پەیداکرد، ماوەیەکی دوور و درێژیش بە ئازاری ئەو پەیوەندییەوە تلامەوە.

ناوی گرنگ نەبوو، کەسایەتیشی... ساڵانێك نەیتوانیبوو خوێندن تەواو بکات، زۆر شۆڕشگێڕ بوو. یەکەم خۆشەویستم بوو کە ڕێکخەری کاری بەدڕەوشتی بوو.

ئیتر ڕۆژەکانی ژێر پردەکە دەستی پێکرد. مەی خواردنەوە، گۆرانی وتن و بێ ئابڕۆیی... پاشانیش لە جێگای نوستنی شۆڕشگێڕێکی بێ نرخدا چاوەکانم کردەوە.

لە ئیستەنبوڵ ئازاد بووم، بەئارەزووی خۆم دەچوومە دەرەوەو، تەنها ئامانجم گەڕان بوو، بەڵام لە یادەوەری کەسێکی بێ نرخدا چێژەکەیم لەدەستدا. کاتێ دەچوومە قوتابخانەیش بە سوك تەماشایان دەکردم، بۆیە خۆم پێ ڕانەدەگیراو خێرا ڕامدەکردەوە بۆ ماڵەوە، هەر لەسەرەتای خوێندنەوە دەستمکرد بە قۆپی کردن لە وانەکاندا. بەخۆمم دەوت: "ئەمە ئازادییە"، بێگومان نەخێر! تۆ لەنێو ئەم چوار دیوارەدا هەرگیز ئازاد نیت، تەنها لە ڕوانگەی بیرەلاوازەکانتەوە ئەمە بە ئازادی لە قەڵەم دەدەیت.

دووبارە ناشکەڕێیتەوە بۆ لای کەسە ساویلکەکانی قوتابخانە.

دەمەویت مەی بخۆمەوە! نامەوێت لە بیرەوەرییەکانمدا هیچ شتێکی بێزارکەر هەبێت، دەمەوێت خۆشحاڵبم بەو ژیانەی کە بەسەرمبردووە، بەڵام بە چی دەچێت ...

زۆربەی کاتەکانم لەژێر پردەکەدا بەسەردەبرد، ئیتر ژێر پردەکە بووبووە ناونیشانی دووەمی من. لەوێدا مەییم دەخواردەوە، لەگەڵ سەرخۆشەکانی تردا ڕامدەبوارد، بەڵام بە تەواوبوونی سەرخۆشییەکە ئازارەکان دەستیان پێدەکردەوە.

کاتێک بیر لەخۆم دەکەمەوە هەست بە شەرمەزاری دەکەم، نەفرەت لەو کارانە دەکەم کە کردوومن، بێزم لە هەڵسوکەوتەکانم دێتەوە... لەناوبچێت مرۆڤی لەم جۆرە، ژیانی لەم شێوەیە...

بەشداری کۆبوونەوەی هاوڕێ شۆڕشگێڕەکانم دەکرد، تێر تێر بەو وتە ناڕاستانەیان پێدەکەنیم کە بەناوی ڕاستییەوە دەیانوت، چونکە خۆیشیان باوەڕیان بەقسەکانی خۆیان نەبوو.

هاوڕێ خۆشەویستەکانی من ئەمانەبوون.

لەگەڵ ئەواندا نانم دەخواردو، دەمخواردەوەو، گفتوگۆم دەکرد، خۆشەویستیم دەکرد. بەئارەزووی خۆم دەڕۆیشتم بەملاولاداو، هەرچییەکم بویستایە دەمکرد، دەم و چاوم نەدەشۆرد، جێگای خەوەکەم نەدەکردەوە، ژیانێکی لەو شێوەیە...

لە ژیانێکدام کە بە تێپەڕبوونی ڕۆژ زیاتر سەخت دەبێت و ناتوانم لێی دەرچم. چەند جێگای خەو، چەند خۆشەویست، چەند کەس کە

ناپـاكيم لەگـەڵ كـردوون... خـوا لـەناوم بـەرێت! نـاوم بـوو بـە ڕۆشنبیرێكی سۆزانی!

كە بیردەكەمەوە سەرم دەكێشم بەدیوارەكاندا، پاش كورتاژ بێزم لەخۆم دێتەوە، ڕوو ڕەش دەبم.

ئیتر بەرگە ناگرم، نەخۆشم، ئێسكەكانم ئـاو دەدەن، نـەفرەت لـە هەموو شتێك و هەموو كەسێك دەكەم.

خێزانەكەم پاش وازهێنانم لە قوتابخانـەش تـەواو بـێ ئومێـدبوون لێم. لە كوێـدا هەڵـەم كـردووە؟ بـەڵام ئەگـەر مـن منـداڵم هەبووایـە، بۆئـەوەی نەكەوێتـە ئـەم شـەرمەزارییەوە نەمدەهێشـت لـە مـاڵ دەربچێت. ئەوەندە هەڵەم كردووە كە لە ژماردن نایەن...

ئیتر تەواو لە ڕێی ژین دەرچووم .

دەزانم پێویستە چی ئەنجام بدەم .

كەس لە ماڵەوە نییە... بەگوێرەی ئەوەی كە هیچ شـتێك نـەماوە بنووسرێت... بەڵێ، ئیتر شانۆی ژیانم تەواو بوو!

(كانات گونێر. ڕووداوی هێرۆین ٥ — ١١٦)؟

كانات گونێری، سەر لێشێواو كە لە ژیاندا هەموو بەها مرۆییەكانی لەدەستدا، خـۆی كوشـت. پێویسـتە هـەموو تـاكێكی كۆمەڵگاكـەمان پەند لە هۆكارەكانی خۆكوشتنی كانات گونێر وەربگرن، بەتایبەتیش دایكان و باوكان و دامـەزراوە پەروەردەییـەكان كـە بەرپرسـیارن لـە پەروەردەكردن و ئاراستەكردنی نەوەكانی داهاتوو.

# فیداکاریی ماموٚستایەکی زانکۆ



زۆر منداڵ بووم کە باوکم کۆچی دوایی کرد. دایکم بەتەنها خۆی پەروەردەی کردم. برا و خوشکی ترم نەبوو. دایکیشم هاوسەرگیری نەکردەوە. بەیەکەوە بەشداربووین لە ناڕەحەتییەکانی ژیاندا. چونکە باری ئابووریمان زۆر لاواز بوو، ماڵ و داهاتێکی ڕێك و پێکمان نەبوو. دایکم خزمەتکاری ماڵانی دەکرد، منیش لەلای هەندێ بازرگان بە پارەیەکی کەم ئیشم دەکرد. بەڵام دایکم نەخۆش کەوت، نەیتوانی لەسەر کارکردن بەردەوام بێت، لەبەرئەوە ناچاربووم زیاتر کاربکەم.

بە هەزار ناڕەحەتی لە زانکۆم وەرگیرام، بەڵام ناڕەحەتی ڕاستەقینە بە وەرگیرانم لە زانکۆ دەستی پێکرد. بە ناچاری دایکیشم هێنا بۆ ئەو شارەی کە زانکۆکەمی لێبوو، خانوویەکمان بە کرێ گرت، منیش لە زانکۆ دەستمکرد بە خوێندن. بەڵام خەرجی یەکجار قورس بوو کە نەمدەتوانی دابینی بکەم.

له حانوتی زانکۆکەدا ئیشێکی شەوانەم بۆ خۆم دۆزییەوە. ئەو پارەیەشی وەرمدەگرت تەنها بەشی کرێ خانووەکەی دەکرد، نە دەرمانم بۆ دایکە نەخۆشەکەم پێ دەستەبەردەکرا، نە خەرجی زانکۆشم پێ دابیندەکرد. ئیتر وازم لە زانکۆ هێنا و، کاتێ لە گەڕانەوەماندابووین بۆ ناوچەکەی خۆمان، لە زانکۆ مامۆستایەکی ئینگلیزی هەبوو کە زۆر خۆشەویست بوو و، منیش زۆرم خۆشدەویست و بڕیارم دا سەردانی بکەم و بارودۆخەکەی بۆ باس بکەم. لە ناخەوە گوێی لێگرتم، تەنانەت چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسک، زۆر هەستی جولا، وتی:"چیرۆکی ژیانی تۆش لە ژیانی من دەچێت" تەنها ئەو ئامۆژگارییانەی بۆ زیاد کرد :

– ئارامبە ها ! مەڵێ واز لە زانکۆ دەهێنم. من دەبمە پاڵپشتت. لە شوێنێك ئیشێك یان دەرماڵەیەکی قوتابیت بۆ پەیدا دەکەم. بۆ دایکیشت هاوڕێی پزیشکم هەیە داوایان لێ دەکەم تیماری بکەن. سەرەتا هەندێ کتێبت دەدەمێ بیانخوێنەرەوەو، هەوڵبدە وزەت بەرز بێت. پاشان زوو زوو چاومان بە یەکتر دەکەوێت و، پێکەوە هەوڵدەدەین کێشەکان چارەسەر بکەین .

زۆر دڵخۆشبووم کە مامۆستا گوێی لێگرتم و بڕیاریدا یارمەتیم بدات. ئومێدێکی زۆری پێ بەخشیم. کاتێ هەموو شتێك چارەسەر بوو سەرلەنوێ "سڵاوم" لە دونیا و زانکۆش کردەوە.

کتێبەکانی ئێوەی پێدام؛ (ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگەڕێ، محەمەدی دوزجەیی، ژیانێکی نوێ)... پاشانیش (پەیامەکانی نور)ی پێدام. بەتایبەتی زۆر سوودم لە پەیامەکان وەرگرت. دیدو بۆچوونم بەرامبەر بە ژیان گۆڕاو، گەشبینانە بەرەو پیری کارەکانم دەچووم. زۆر بەجوانی پەرستشەکانم ئەنجام دەداو لەناخەوە هەستم بە شادی و خۆشحاڵی دەکرد.

مامۆستاکەم ئیشێکی باشتری بۆ دۆزیمەوە. تیمار کردنی دایکیشمی بە پزیشکەکانی هاوڕێی سپارد. منی وەك منداڵێکی خۆی پاراست و چاودێری کردم، لەگەڵ دایکمدا زۆری بۆ پاراینەوە.

مامۆستاکەم بۆ خوێندنی ئەکادیمی چوو بۆ ئینگلتەرا. منیش گەیشتمە دوایین قۆناغی خوێندن.

لە شوێنی کارکردنەکەم پارەیەکی باشم دەست دەکەوت. بەڵام لەدوای ڕۆیشتنی مامۆستاکەم ئەو ڕاستییەم بۆ دەرکەوت کە بەشێك لەو پارەیە مامۆستاکەم هەموو مانگێك لە گیرفانی خۆی دابوویە سەرکارەکە .هەروەها پارەی تیمارکردنی دایکیشمی لە گیرفانی خۆی دابوو. واتە مامۆستاکەم سێ ساڵ بە توانای خۆی ئاگاداری ئێمەی کردبوو .

هەموو ئەو ڕاستیانەم بۆ دەرکەوت، سەرسام بووم. چۆن مرۆڤێك ئەوەندە باش دەبێت؟ ئەوەندە فیداکار دەبێت؟ ئەوەندە حەزی لە یارمەتیدان دەبێت؟

ئـەم هەڵوێسـتـە جوامێرانەیـەی مامۆسـتاکەم بـیر و دیـدەکانمی بەرامبـەر ژیـان و مرۆڤـەکان گـۆڕی و زیـاتر گەشـبینی کـردم، فێـری ئەوەی کردم کە پێویست ناکات مرۆڤ بۆ ژیان نیگەران ببێـتو یـاخی ببێت، بەڵکو پێویستە هەموو مرۆڤێك لە ژیاندا هەوڵبدات ڕووبـەڕووی کێشەکان ببێتەوە، ئەو کاتە خـوای بەبـەزەیی دەرگـای ڕزگـاربوونی لەبەردەمـدا والآ دەکـات. خـوای گـەورە لـە مامۆسـتاکەم و هاوشێوەکانیو ئێوەش ڕازی بێت، نموونەی مامۆستایانی لەو جۆرە زیاد بکات تا کەسانی بێچارەو لانـەوازی وەك ئێمـە ڕزگاربکـەن لـە یاخی بوون.

ئەمرە چاودار

# گاتس و قاوشی بەکاربەری

# ماددەی هۆشبەر



لە ویلایەتی فلۆریدای ئەمریکا بەندیخانەیەکی بەناوبانگ هەیە بە ناوی (خانەی چاکسازی)، ئەو گەنجانەی لێدەمێنێتەوە کە ئالودەی ماددە هۆشبەرەکان بوون.

(ماڵی چاکسازی) وەك لە ناوەکەشیدا ئاشکرایە؛ گەنجەکان بە ئاراستەی ڕزگاری دەبات لە خووە زیانبەخشەکانو، خەریکی پراکتیزە کردنی بەرنامە پەروەردەییەکانە. پەیوەست بەو گەنجانەی کە ئالودەبوون بە ماددە هۆشبەرەکانەوە، ژمارەی ئالودەبووانیش ڕۆژ بەڕۆژ لەزیادبووندایە بەجۆرێك کە(ماڵی چاکسازی) بەو گەنجانە خەریکە پڕ دەبێت.

وەك ئاشکرایە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لەلایەن تاکەکانەوە ژیانی کۆمەڵگا دەشێوێنێت و زۆرێك لە بەها

مرۆڤایەتیەکان دەسرێتەوە، بۆ دەربازبوون لەم خووە زیانبەخشە ئەم دامەزراوەیەو هاوشێوەکانی لەسەر سێ ڕێگا دەڕۆن:

١- هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی کار بۆ گەنجەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی ماددییان... بەڵام لە ئەنجامدا بۆیان دەرکەوتووە کە لە بەرزبوونەوەی ئاستی ماددیدا چاوەڕوان دەکرێت بەکاربەرانی ماددە هۆشبەرەکان ژمارەیان زیاتر ببێت.

٢- ڕاوێژکردن بە دەروونناسان بۆ ڕزگارکردنی گەنجەکان لەو خووە زیان بەخشانە، بەڵام پاش ماوەیەك دەرکەوتووە کە هەندێك لە ئالودەبووان سەرەڕای مانەوەیشیان لەژێر چاودێری پسپۆڕی دەروونناسیدا هەر وابەستەن بە ماددە هۆشبەرەکانەوە.

٣- سەردان کردنی قەشەکان، کە دواتر بۆیان دەرکەوتووە کە ئەم ڕێگەیەش کاریگەری نییە.

گاری نیکاڵس بەڕێوەبەری بەندیخانەکەو، ماری بێر بەڕێوەبەری توێژینەوەی دەروونناسی سەبارەت بەوەی کە چۆن چارەسەرێك بۆ ئەم بارودۆخە بدۆزنەوە، لە لایەکەوە توێژینەوەی جۆراو جۆریان ئەنجامداو، لە لایەکی دیکەشەوە پێشنیازەکانی بابەتەکەیان بردە لای پسپۆڕەکان .

سەبارەت بە قاوشی بەناوبانگی (A) ڕاپۆرتێکی زۆر سەیر بۆ بەڕێوەبەری (ماڵی چاکسازی) دێت، کە ڕابەرانی گەنجانی بەکاربەری ماددە هۆشبەرەکان تیایدا بەندکراون. لە ڕاپۆرتەکەدا نووسراوە؛

ئەو کەسانەی ماددەی هۆشبەر بەکاردەبەن زۆر ئارام کراونەتەوە، شەڕ ناکەن و، دەستیان کردووە بە دوورکەوتنەوە لە هەڵسوکەوتی تێکدەرانە.

گاری نیکاڵس بەڕێوەبەری بەندیخانەکە ئەو فەرمانبەرەی راپۆرتەکەی پێشکەش کردبوو بانگ دەکاتە لای خۆی و، لەگەڵ ماری بێر بەڕێوەبەری توێژینەوەی دەروونناسی بەیەکەوە داوای وردەکاری و زانیاریی لێدەکەن .

ئەو فەرمانبەرەی بەدواداچوونی لە قاوشی (A) کردبوو، دەڵێت:

– منیش سەرم سوڕماوە. قاوشی (A) قاوشێکی بەدناو بوو، هەموو ڕۆژێك کاری سەرشێتانەی تیا ئەنجام دەدراو خوێنی تیادا دەڕژرا. بێجگە لە هەواڵی بێزارکەر و ناخۆش هیچ شتێکی دیکەم لە راپۆرتەکەمدا نەدەنووسی، بەلاّم لەم مانگەدا شتێکی سەیر لەو قاوشەدا ڕوویداوە !

نیکاڵسی بەڕێوەبەر و بێری دەروونناس بە تاسەوە پرسییان:

– شتی وەك چۆن؟

– وەك لە راپۆرتەکەمدا ئامـاژەم پێکردووە، بەندییەکان ئارام بوونەتەوەو، هێرش ناکەنە سەر یەکتری و بەهیچ جۆرێك زیان بەکەس ناگەیەنن، تا ئێوارە بەهێمنی دادەنیشن و کتێب دەخوێننەوەو، گفتوگۆ دەکەن .

– چ کتێبێك دەخوێننەوە؟ بابەتی گفتوگۆکەیان چییە؟

- نەمتوانی بە تەواوی ئەمە شیکار بکەم، بەڵام کەسێك هەیە کە وردەکارییەکانی ئەم بابەتە باس دەکات.

بەڕێوەبەرەکە یەکسەر پرسی:

- ئەو کەسە کێیە؟

- دوو مانگ لەمەوبەر کەسێکی تەمەن مام ناوەندی پەروەردەییان هێنا، ناوی (داریێل گاتس)ە. لە ئۆتۆمبێلەکەیدا ماددەی هۆشبەریان دۆزیوەتەوە، بەڵام دیارە کە خۆی هیچ پەیوەندییەکی بەم ئیشانەوە نییە. کەسانێك تووشیان کردووە، چونکە مرۆڤێکی زۆر سەر ڕاست و کاریگەرە، لە هەمان کاتدا شوێنکەوتەی محەمەدە، واتە موسوڵمانە.

گاری نیکاڵس بەڕێوەبەری بەندیخانەی (ماڵی چاکسازی)، لەگەڵ ماری بێر بەڕێوەبەری توێژینەوەی دەروونناسیو، پشکنەری قاوشی (A) دا چوون بۆ قاوشەکە، دیمەنێکی زۆر سەیریان بەرچاوکەوت؛

هەموو بەندییەکان لەیەك ڕیزدا ڕوویان کردبووە یەك لا، بەبێ دەنگی ڕاوەستابوون و، کەسێکیش لەبەردەمیاندا ڕابەرایەتی دەکردن...

نیکاڵسی بەڕێوەبەر بە سەرسوڕمانەوە لە فەرمانبەری قاوشەکەی پرسی :

- ئەمانە چی دەکەن؟ ڕەنگە هەموویان ژیرییان لەدەستدابێت، یاخود بڕێکی زۆر ماددەی هۆشبەریان هێنابێت.

فەرمانبەرەکە بەدڵخۆشییەوە وتی:

– ئەو کەسەی بۆم باسکردن ئەوەیە کە لە پێشی پێشەوە ڕابەرایەتی دەکات. با چاوەڕوان بکەین، ئیشەکەیان تەواو بکەن، ئەم پرسیارانە لەو دەپرسین.

بەندییەکان لە ناو جۆش و خرۆشێکی زۆردا بە کەلەپچەکراوی بەپێوە دەوەستان و بە ڕێك و پێکی دەچەمانەوەو، سەریان دەخستە سەر زەوی و، لە دڵەوە بە پاڕانەوەوە دەیانڕوانی بۆ ئاوات و خواستەکانیان.

بە تەواوبوونی کاری کۆمەڵەکە، بەڕێوەبەر داریێل گاتسی ڕابەری کۆمەڵەکەی بانگ کردە لای خۆی:

– ئێوە چی دەکەن؟

گاتس بەوپەڕی متمانە بوخۆبوونەوە وتی:

– ئێمە نوێژمان کرد.

– ئەمە مانای چییە.

– نوێژ، پەرستشێکی موسوڵمانانە. هەموو ڕۆژێك پێنج جار دەچینە حزوور خوای پەروەردگارو، بەندایەتی خۆمانی پێ ڕادەگەیەنین و داوای یارمەتی لێ دەکەین .

– واتا ئێوە موسوڵمانن؟

– بەڵێ.

– باشە، ئەم ئالودەبووانەش موسوڵمان بوون؟

- بەڵێ.

سەرسوڕمانی بەڕێوەبەرکە زیادی کرد:

- ئەو سوودانە چین کە موسوڵمانێتی بۆ تاك و کۆمەڵگای دەستەبەر دەکات؟

- موسوڵمانان، باوەڕیان بەوە هەیە کە بۆ تاقی کردنەوە هاتوونەتە دونیاوەو، دوای مردن دووبارە زیندوو دەکرێنەوە، لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت دەربارەی ئەو کارانەی کە ئەنجامیانداوە. لە ژیانیاندا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای بەدیهێنەرو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا حەزرەتی موحەممەدﷺ دەکەن، هەموو ژیانیان بەپێی قورئان و ئامۆژگارییەکانی حەزرەتی پێغەمبەرﷺ ڕێکدەخەن.

بەڕێوەبەری (ماڵی چاکسازی) بەردەوامی دەدا بە پرسیارەکانی:

- باشە، موسوڵمانان لە ژیاندا چۆن هەڵسوکەوت دەکەن؟

- ئەو پەرستشانە ئەنجام دەدەن کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردوون، ڕێز لە ماف و یاساکان دەگرن، هەرگیز بەبێ مۆڵەت دەستکاری هیچ شتێکی کەسێکی تر ناکەن، خۆیان بەدوور دەگرن لە تێکدانی ئاسوودەیی کۆمەڵگا، زۆر دوورن لەو هەڵسوکەوتانەی کە کۆمەڵگا ناتەندروستەکانیان تەنیوە وەك درۆ، فێڵ، فریودان، دزیی، کوشتن، بوختان و دەستدرێژی کردنە سەر مافی کەسانی دیکەو، متمانە نەبوون بە بەدیهێنەرو، شێواندنی بەهاکانی مرۆڤایەتی. لە

گرنگترین ئەو هەڵسوکەوتانەی لە موسوڵمانان داواکراون بریتین لە: پەیداکردنی پارە بە ئارەقی نێو چەوانو، یارمەتی دانی نەدار و داماوەکان و، بەجێهێنانی ئەرکی بەندایەتی لەگەڵ ئەندامەکانی خێزاندا.

ماری بێری دەروونناس لە بەرامبەر باسەکانی (دارییل گاتس)دا خۆی بۆ ڕانەگیراو وتی:

– ئەگەر ئەوەی باسی دەکەیت ڕاست بێت، ئەوا لە کۆمەڵگادا کێشە نامێنێت، واتە ئێمەش بێ کار دەمێنینەوە!

گاتس دەپرسێت: "ئایا ناگونجێت؟"

بێریش دەڵێت:"بەسە تۆ ڕاست دەکەیت، قایلم"

بەڕێوەبەر بەردەوامە لەسەر پرسیارەکانی:

– تۆ چۆن هێنراویت ئێرە؟

– ماددەی هۆشبەریان کردبووە ناو ئۆتۆمبێلەکەمەوە و پاشانیش هەواڵیان لێ دابووم.

– بۆچی؟ کە تۆ کەسێکی ئەوەندە سەر ڕاست بیت، لەبەرچی ئەمە دەکەن؟

– لەبەرئەوەی سەر ڕاستیی تەگەرە لەبەردەم قازانجی ئەوانەدا دروست دەکات کە کاری نادروست دەکەن.

بێری دەروونناس دەپرسێت: ئێوە چۆن بوونە موسوڵمان؟

- کاری من پەروەردەییە، ماوەیەك مامۆستاییم کردووە. لەو قوتابخانەیەی کە مامۆستا بووم تیایدا مامۆستایەکی لێ بوو خەڵکی میسر بوو. هەڵسوکەوتەکانی زۆر کاریان تێکردم، بووین بە هاوڕێو، هاوینی ڕابردوو بەیەکەوە چووینە میسرو، عەرەبستانی سعوودیەو، پاکستان و تورکیا. بە تایبەتی ئەو کەسانەی لە تورکیادا ناسیمن زۆر کاریگەرییان هەبوو لە سەرم. لە دونیای ئیسلام و دینی ئیسلام وردبوومەوە، موسوڵمان بووم.

بەڕێوەبەرەکە چاوی بڕیبووە ئەو کتێبانەی لەسەر مێزەکە دانرابوون:

- بۆچی ئەم کتێبانە دەخوێننەوە؟

- ئەم کتێبانە، تەفسیری قورئانن لە تورکیاوە هێناومن. (پەیامەکانی نوور)ی مامۆستا سەعیدی نوورسین بە زمانی ئینگلیزی... زۆر سوودم لێ وەرگرتوون. ئێستاش هەموو پێکەوە ئەم کتێبانە دەخوێنینەوە.

بەڕێوەبەر وەك ئەوەی چارەسەرێکی بۆ کێشە بێ چارەکانی چەندین ساڵەی ناو کۆمەڵگا دۆزیبێتەوە، وتی:

- بێر، ئاگاداریە. ئەمە چارەسەرێکی کاریگەرە بۆ کێشەی بەندییەکان چی دەڵێیت؟

بێر، دەڵێم پێی ڕازی بین، ڕێگەچارەیەکی پڕبایەخە.

پاشان نیکاڵسی بەڕێوەبەر دەستی خستە سەر شانی (گاتس)و، هاواری کرد.

ئەمە زۆر سەرسوڕهێنەرە. هێنانە سەر ڕێی ئەو گەنجانەی کە ئێمەو کۆمەڵگا و خێزانەکانیان بە دەستیانەوە بێزاربووین، ئەگەر لێرە لە پەیڕەوکردنی ئەم بەرنامەیەدا سەرکەوتووبووین، ئەوا پێویستە لە هەموو بەندیخانەکانی ئەمریکادا بڵاوبکرێتەوە، تەنانەت لە هەموو کۆمەڵگای ئەمریکیدا... لەمەودوا هەر داخوازییەکتان هەبێت جێبەجێ دەکرێت. هەر چییەك بخوازن... کتێب؟ پارە؟ لەسەر ڕزگارکردنی ئەم گەنجانە بەردەوامبن بۆ ئەوەی چیتر کۆمەڵگا بەدەست ئەم کێشانەوە نەناڵێنێت.

باسەکانی گاتس و ئەوانەی لە بەندیخانەکەدابوون زۆر کاریگەرییان لەسەر نیکاڵسی بەڕێوەبەر و بێری دەروونناس بەجێهێشت. ئەم بەرەو پێشچوونە یەکجار سەرسوڕهێنەر و گرنگ بوو. ئەمریکا بەو هەموو پێشکەوتنە تەکنەلۆجییەوە بێ توانایە بەرامبەر کێشەیەك، بەڵام موسوڵمانێك بە هەڵسوکەوت و ڕەوشتی جوانی چارەسەری دەکات. ئەمە وەرچەرخانێکی گرنگ بوو بۆ کۆمەڵگای ئەمریکی، خێرا بڵاوبوونەوەی ئیسلامیش لە نێوان هاوڵاتیانی ئەمریکیدا لەمانەوە سەرچاوە دەگرێت.

ئەو ڕۆژەی کە نیکاڵسی بەڕێوەبەری (ماڵی چاکسازی) و بێری یاریدەدەری لە ساڵی ١٩٩٨ موسوڵمان بوون، لە بەندیخانەکەدا

مەراسیمێك ڕێكخرا، یەكەمین جار بوو پەروەردەییەكان لەگەڵ بەندییەكاندا دەست لەناو دەست بكەن.

وتەی نیكاڵسی بەڕێوەبەر لە مەراسیمەكەدا، نەك تەنها بۆ ئەمریكا بەڵكو بۆ هەموو ئەو مرۆڤانەی وریان لەدەستداوە وانەیەكی پەروەردەیی و، پێشنیارێكی گرنگ بوو.

- بەڕێزان، ئەمڕۆ سەرلەنوێ لە دایكبوونمان پیرۆزدەكەین. گەورەترین داهێنان بۆ مرۆڤەكان و كۆمەڵگاكان، گەورەترین بەدواداچوون و متمانە و ئاسوودەیی؛ بوونە بەندەی خوای گەورەیە بە زانین و سەركەوتنەوە. ئەو مرۆڤەی كە بە تێگەیشتنی تەواوە ئیمانی بە خوای پەروەردگار هەیە هەم خۆی و هەمیش كۆمەڵگا لە خراپەكارییەكان بەدوور دەگرێت. ئێستا پێویستە بە خێرایی ئەم ئیمانە بە كۆمەڵگادا بڵاوبكەینەوە. پێویستە هەر لە ئێستاوە بۆ هەر بەندیخانەیەك و، قوتابخانەیەك و جێگایەكی ئیش و تەنانەت بۆ هەر خێزانێك گاتس ئاسایەك دابنێین، ئەگینا داهاتووی ئەمریكا زۆر مەترسیدار دەبێت. مرۆڤەكان بە هێز و، فشار و، پارە كۆنترۆڵ ناكرێن، چونكە ئەو كەسانەی كە دەیانەوێت خەڵكانی دیكە كۆنترۆڵ بكەن ئەو كەسانەن كە لە نێو خووە زیانبەخشەكاندان. پێویستە لەپێناو بەرەوپێشبردنی ئەمریكاو ئاسوودەیی كۆمەڵگاكەماندا هانی بڵاوبوونەوەی ئیسلام بدەین.

# واته.. ئێوه.. ئەو پیاوەن؟



هــەموو ســاڵێك لــە مــانگی ڕەمەزانــدا بانگهێشــت دەكــرام بـۆ پێشـانگای كتێـب كـە لـە حەوشـەی مزگـەوتی سـوڵتان ئەحمـەد دەكرایەوە.

ڕووخسارە گەشاوەكان، ئەو پرسیارانەی بە خەیاڵدا نایەن، ئەو هەستانەی لە دڵەوە و دڵسۆزانە بەرهەمەكانیان دەنرخاند، پیرۆزبایی و دەستخۆشــی و تەنانــەت سەركۆنەكانیشــی جـۆش و خرۆشـێكی زۆریان پێدەبەخشیم. لەم یەكتر بینینەدا لەگەڵ خوێنەرەكانـدا یـەك مەبەســت كۆیكردینــەوە ئــەویش هەڵســەنگاندنی كــارو بەرهــەمی نووســەران و ئامادەكــاران بــوو لەلایــەن خوێنــەران و ئامــادەبووانی پێشانگاكەوە.

ســەرنج و تێبینــی ئامــادەبووان ســەبارەت بــە بەرهەمــەكان بەرچـاو ڕوونییان پێدەبەخشیم و ئەزموونێكی گرنگ بوو بۆ من.

لەکاتێکدا ڕێگای (ئەمینۆنو)م گرتبوەبەر، لە کەشتییەکەدا بیرم لەمانە دەکردەوە.

لە کەشتییەکەدا لە تەنیشت جامەکەوە دانیشتم، زۆر سەیر نوقمی نێو دەریای خەیاڵ بووم.

پاش کەمێك بە قسەکردنی پڕ کەیفی دوو پیاوی بە تەمەن، لەگەڵ دوو ئافرەتی گەنج بە ئاگا هاتمەوە .

لەگەڵ پیاوە بە تەمەنەکاندا بە ئیشارەت کردنێکی سادە سڵاومان لە یەکتر کرد، زۆریش تێنەپەڕی یەکترمان ناسی. پیاوە پیرەکان باوکی ئافرەتە گەنجەکان بوون. کچە گەنجەکانیش خوێندکاری زانکۆ بوون. بەیەکەوە دەچوون بۆ پێشانگای کتێبی سوڵتان ئەحمەد .

یەکێك لە کچە گەنجەکان کە ناوی (عاکیف) بوو، چانتا دەستییەکەی کردەوە. لە ناویدا کتێبەکەی منی بە ناوی (ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگەڕێت) دەرهێنا، لەو جێگایەی کە تیایدا وەستابوو دەستی کردەوە بە خوێندنەوە .

پرسیم: "چۆن کتێبێکە؟"

وتی: "زۆر ناوازەیە. کتێبەکانی (محەمەدی دوزجەیی) و (خۆم دۆزییەوە)ی ئەم نووسەرەم خوێندووەتەوە. ئێستاش ئەمە دەخوێنمەوە. ڕاسپاردەیەکتان پێدەڵێم، زۆرتان بە دڵ دەبێت؛

ئەگەر منداڵتان هەیە، ئەم کتێبانەیان بۆ بکڕن و پێشکەشیان بکەن. بەڕای من ئەم کتێبانە جوانترین دیاری باوکن بۆ منداڵەکانی".

کچە گەنجەکەی هاوڕێشی کە لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو پاڵپشتی قسەکانی عاکیفە خانی کرد کە بە گیان و لە دڵەوە دەیکردن.

یەکێك لە پیاوە بە تەمەنەکان هاتە پێشەوە :

پرسی:"چ کارێك دەکەیت؟"

وتم:"مامۆستای زانکۆم".

بۆ ساتێك خۆی کشانەوە و خۆی ڕێك کردو، بە دەنگێکی کەمێك هێواشتر وتی:

– کچەکەم ببورن. ئێوە ئەم کتێبانەتان خوێندووەتەوە. لەبەرئەوەی ئەم کتێبانە کاریگەرییان هەبووە لەسەری هەرکەس دێتە بەردەمی پێشنیاری ئەوەی بۆ دەکات کە بیانخوێنێتەوە.

وتم:

– نا نا زۆر ئاساییە. کچەکەت، ڕاست دەکات. بە دڵنیاییەوە پێویستە مرۆڤ ڕابسپێردرێت بۆ خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە ئامانج و ئەرکەکانی بەندایەتی بیری مرۆڤ دەهێننەوە. ئەمە ئەرکی هەموو مرۆڤێکی خاوەن پەیامە.

لەمەوە کچە گەنجەکە ڕووی کرایەوە پرسی:

– شوێنی کارەکەتان لە ئیستەنبوڵە؟

وتم:

– نەخێر، لە دەرەوەی ئیستەنبوڵم.

– چ وانەیەك دەڵێنەوە؟

– وانەی پەروەردەیی.

– منیش لە كۆلێجی پەروەردەم. خۆزگە مامۆستایەكی وەك ئێوە تێگەیشتوو وانەی پێ بوتینایەوە. ئێمەیان بە هیلاكا بردووە .

وتم: نا وا نییە. مامۆستاكان بە هیلاكتان نابەن. تەنها لەوانەیە بیانەوێت زیاتر هەوڵبدەن و خۆتان ماندووبكەن.

پرسی: مامۆستا، ناوتان چییە.

وتم: خالید ئێرتوغروڵ.

بەڵام كچە گەنجەكە هیچ بیری بەلای ئەوەدا نەچوو. لە كوێوە دەزانێت (خالید ئێرتوغروڵ)ی مامۆستای زانكۆ لەگەڵ (خالید ئێرتوغروڵ)ی سەر بەرگی كتێبەكە هەمان كەس بن...

– بۆ ئەركێك هاتوون بۆ ئیستەنبوڵ؟

– بەڵێ، بەڵام منیش بەم هۆیەوە سەردانێكی پێشانگەی كتێبەكە دەكەم.

– زۆر باشە، مامۆستا، نووسەری ئەم كتێبە ئەمڕۆ واژوو لەسەر كتێبەكانی دەكات. ئێمە دەچین بۆ ئەوەی بیناسین و ، هەمیش واژوو لەسەر ئەم كتێبانە بكات.

سەرسام بووم لەوەی کە چی بەم ئافرەتانە بڵێم کە سوودیان لە کتێبەکانم وەرگرتووە. ئایا ئێستا باشە بۆ یەکتر ناسین، یاخود لەکاتی واژوو کردنەکەدا. ڕاستییەکەی بوار نەمابوو، پردی کەشتییەکە گەیشت، ئێمەش دابەزین. بەهۆی قەرەباڵغییەوە یەکترمان ون کرد. بەڵام لە شوێنی واژووکردنەکە ڕووبەڕووی یەکتر دەبووینەوە. زۆر بیرم لەو کاتە دەکردەوە، ئاخۆ چۆن کاردانەوەیەکم دەبێت.

پاش ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ کەمێك درەنگ چووم بۆ شوێنی واژوو کردنەکە. تا بڵێی قەرەباڵغ بوو.

خێرا دەستم کرد بە واژووکردنی کتێبەکان و لەم نێوەندەشدا کەم کەم دەمەتەقێم لەگەڵ خوێنەراندا دەکرد. بەدرێژایی ئەو ماوەیەش هەر لە بیری سەرسوڕمانی کتوپڕی عاکیفە خانمدا بووم.

زۆری نەخایاند، گوێبیستی هاوارێك بووم، وتی:

– ئائائائا، ئەو پیاوەبوو.

من و هەموو ئەو خوێنەرانەی دەوری مێزی واژووکردنەکە ڕوومان کردە ئاڕاستەی هاتنی دەنگەکە.

عاکیفە خانم لەگەڵ هاوڕێ گەنجەکەی تەنیشتی و پیاوە بەتەمەنەکاندا لە سەرسوڕمانییەکی زۆردا بوون.

بە دەنگێکی پڕ جۆش و خرۆشەوە وتی:

– گلەییت لێ بێت مامۆستا گیان. بۆچی لە کەشتییەکەدا ئـەوەت شاردەوە کە تۆ خالید ئێرتوغرولێیت؟

وتم: بۆئەوەی تۆ بخەمە ئەم سەرسامییە کتوپڕەوە.

– منـت زۆر سەرسـام کـرد. بـە درێـژایی تەمـەنم ئـەم ڕووداوە کتوپڕە لە بیر ناکەم.

گەڕامەوە بۆ لای خوێنەرەکانم وتم:

وا هەست دەکەم بیر لەو جۆش و خرۆش و سەرسامییەی عاکیفە خانم دەکەنەوە، بۆئەوەی تێبگەن گوێم لێ بگرن، چونکە زۆرێك لـە خوێنەرانی کتێبەکانم دەپرسن: لەبەرچی ئـەو ڕووداوە ناوازانـەی لـە کتێبەکانـدا بـاس دەکـرێن هـەر بەسـەر تـۆدا دێـن. ئـەوەتا ئـەوە نموونەیـەکی زینـدوو... هـەموو ئەمانـەش توانسـتی خـوای پەروەردگارن، کە زاناو ئاگادارە بـەحاڵی بەنـدەکانی. ویسـتی وابـوو کە زۆرترین وانە لە ڕووداوەکانەوە وەربگرم.

# هەڵەمان کرد

هاوڕێی زۆر بەڕێزم کاک خالید..

هەرچەندە ساڵانێکی دوور و درێژە ڕووبەڕوو یەکترمان نەبینیوە، بەڵام کاتێك کتێبەکانت دەخوێنمەوە هەست دەکەم کە هێشتا هەر لەیەك دوورنەکەوتوینەتەوە.

درێژەدانت بە هەوڵەکانت لەبواری نووسیندا بەرهەمی زۆر باشی بەخشیووە. بە بینینی کتێبەکانت لە پێشانگای کتێب فرۆشەکاندا، وەك هاوڕێیەکی دێرینت هەست بە شەرەفێکی زۆر گەورە دەکەم. هەندێ جاریش کە دەچمە لای کتێب فرۆشەکان بە وتنی ئەوەی "نووسەری ئەم کتێبانە هاوڕێی قوتابخانەمە" خۆم پشکدار دەکەم.

تا ئێستا نەمتوانیوە لە تەلەفۆندا درێژەی ئەو ڕووداوانە باس بکەم، دیارە هەنوکەش لەسەر پێداگری تۆ قەڵەم هەڵدەگرم و ئەم بەسەرهاتە دەنووسمەوە، هیوادارم ببێتە مایەی خێر.

دوای ئەوەی لەگەڵ تۆدا لە قۆناغی دواناوەندی دەرچووین و دەستمانکرد بە خوێندنی زانکۆ، شەڕی ڕاست و چەپی قوتابخانەکەمان لە لوتکەدابوو. مامۆستاکانمان هەندێکیان لایەنگری ڕاست و هەندێکیشیان لایەنگری چەپ بوون. ئێمەی قوتابیانیش بەهەمان شێوە دابەش بووبووین بەسەر ئەو دوو دەستەیەدا.

منیش لەبەر ئەوەی لەخێزانێکی دینداردا پەروەردە کرابووم وابەستەی ئایین بووم و لایەنگری ڕاست بووم.

یەکێك لەو مامۆستایانەی کە لە قوتابخانەکەماندا خاوەنی بیروباوەڕی چەپ بوو، هەندێ جار لەپڕ دەهاتە نێو چەند وانەیەکی ئێمەوە. ئەو پسپۆڕێکی باش بوو لە گۆڕەپانەکەدا. لە سیاسەتیشدا کەسێکی سەنگین بوو. بەڵام بێ بڕوا و خودا نەناس بوو. باوەڕی بە خوداو پێغەمبەرو قورئان و هیچ بابەتێکی ئایینی نەبوو، جگە لەوەش بە ئاشکرا نکۆڵی دەکرد .

ئێمەش بەرامبەر بەم هەڵوێستەی مامۆستاکەمان، لەجیاتی قەناعەت پێکردن و ڕازیکردن ڕێگای بەرەنگاربوونەوەمان بە باشتر دەزانی.

چەند جار لە مامۆستاکەمان دا، ڕووخساریمان برینداركرد، هەڕەشەمان لێکرد، زیانمان بە ئۆتۆمبێلەکەی گەیاند و شوشەی پەنجەرەکانی ماڵەکەیمان هێنایە خوارەوە.

ئەوەش سەرکێشیەکانی گەنجێتی! پێمان وابوو بەو جۆرە کارانە خزمەت بە ئایین دەکەین. بەدڵنیاییەوە لەو تەمەنەدا نەماندەزانی کە ناکرێ بە لێدان و ترساندن قاییل بکرێت.

کاتێ بەسەریدا دەهاتین، مامۆستاکەمان زیاتر تووڕە دەبوو و، زۆر زیاتر گوڕی بە کۆششەکانی دەدا.

قوتابخانەمان تەواوکردو، بووین بەخاوەن پیشەی جۆراوجۆر. هاوکات بەگژیەکداچوونەکانی کۆمەڵگا ئارام بوونەوە. ئیتر ئێمەش هەستمان بەو هەڵانە کرد کە ئەنجاممان دابوون. تێگەیشتین کە قایل کردنی کەسەکان بە هەر بیروباوەڕێك لەڕێگەی ترساندن و توندڕەوییەوە بەدی نایەت، بەڵکو لەڕێگەی گفتوگۆی هێمنانەو قەناعەت پێکردنەوە دێتەدی.

هەرچۆنێك بێت سالآن تێپەڕین، بەمەبەستی بەجێهێنانی کارێك هاتم بۆ ترابزۆن. ئەو ماڵەی بە کرێم گرتبوو نزیك مزگەوت بوو. ڕۆژێکی هەینی کاتێ لە مزگەوت دەهاتمە دەرەوە ڕووبەڕووی کەسێك بوومەوە کە زۆر لەو مامۆستا خودا نەناسەمان دەچوو، چونکە ئەو مامۆستایەشمان خەڵکی ترابزۆن بوو. بیرمکردەوە وتم لەوانەیە ئەم کەسە برا یان خزمی بێت، چونکە ئەو کەسەی کە بینیم کڵاوی لەسەردا بوو و ڕیشیشی هەبوو. چووم بۆ لای وتم:

– ببوورە، تۆ لە مامۆستایەکم دەچیت، ئەویش خەڵکی ترابزۆن بوو. لە زانکۆ مامۆستام بوو...

هێشتا قسەکانم تەواو نەکردبوو وتی:

– نالێیت ئەوە ئەو مامۆستایەمە!

ناتوانم باسی بکەم زۆر شەرمەزاربووم، وتی:

– گرنگ نییە کوڕم. ئەو سەردەمە ڕاستی لەگەڵ چەوتی و درۆکاندا تێکەڵی یەکتری ببوون، سەردەمێك بوو کە خاوەن بیروباوەڕە جیاوازەکان بەگژیەکدا دەچوون. لەو سەردەمەدا هەردوولامان هەڵەمان کرد، لە کاتێکدا دەکرێت کێشەی نێوان مرۆڤەکان لەڕێگەی گفتوگۆو لێکتێگەیشتنەوە چارەسەر بکرێت، بەبێ ئەوەی هیچ کەس ناچار بێت پەنا بباتە بەر هێرشکردن و شەڕکردن. ئەگەر بیروڕاکانت بە هێز بچنە پێشەوە، شەڕ و دوژمنایەتی لەدڵدا ناگیرێن.

مامۆستاکەم زۆر ڕاستی وت.

بە بیری کێدا دەهات خودا نەناسێکی بەناوبانگ بگەڕێتەوەو، دەست بکات بە نوێژ کردن‌و، ڕیش بهێڵێتەوە؟ لەوانەشە ئەگەر ئێمە لەو ساڵانەدا تێگەیشتووانەتر هەڵسوکەوتمان بکردایە، مرۆڤی وەك ئەم زووتر ڕاستییان ببینیایە. لەبەر شێوازی هەڵەی ئێمە کەسانێکی زۆر پێداگرییان کرد لەسەر ڕێبازی بێباوەڕی بمێننەوە.

هیوام وایە جارێکی تر هەڵەی لەو جۆرە دووبارە نەکەینەوەو، لەو ڕۆژانەشدا نەژینەوە. بەهیوای بینینەوەت، لە ئامانەتی خوادا بیت.

# ئەسرینە ترسێنەرەکانی

## فارووق



بەیانیان ماندووبووم بەدەستی وانە وتنەوەو، نیوەڕوانیش کە دەگەڕامەوە ماڵەوە یەکسەر دەچوومە ژوورەکەمەوە تا کەمێك پشوو بدەم، بەڵام ئەوەندەی پێ نەدەچوو لەدەرگا دەدرا.

ئەمڕۆش کە وتم با کەمێك پشوو بدەم، یەکسەر لە دەرگا درا. هەر کە دەرگام کردەوە وەك هەمیشە فارووق خۆی کرد بەژووردا.

فارووق منداڵی خێزانێکی کەم دەرامەت بوو، قوتابییەکی غەریبو، نییەت باش و تێکۆشەربوو .

بەردەوام لە هەوڵ و تێکۆشاندا بوو بۆ ئەوەی بەسەر کێشەکانیدا زاڵ بێت، بۆ ئەم مەبەستەش زوو زوو سەردانی دەکردم و پرسیاری جۆراوجۆری لێ دەکردم، دەیویست شتانێکی زۆر بزانێت و لە ڕووداوەکان تێبگات.

تەنها کەموکوڕی ئەوەبوو کە زۆر هەست ناسك و پەشۆکاو بوو. لەبەرئەوەی دەیویست خێرا هەموو کارەکانی لە یەك کاتتدا ئەنجام بدات، پێویستییەکانی سەرکەوتنی زۆر باش بەدەستنەدەهێنا.

سەرلەنوێ ئەمڕۆ ئەو جۆش و خرۆش و ترسەی لەسەردابوو. بە گەشانەوەی چاوەکانیدا دیاربوو، کە چەندە لە بێ ئارایمیدایە بۆ ئەو بابەتەی دەیویست پرسیاری لە بارەوە بکات و لێی تێبگات.

بۆ هێورکردنەوە و ئارامکردنەوەی وتم:

– فارووق پەلە مەکە، کاتم زۆرە. تا کۆتایی گوێت لێدەگرم، هیچ پەلە مەکە، یەکەمجار بەو شێوەیە دانیشە، دەی با بزانم.

بەرامبەرم دانیشە، داوای دوو چام کرد. چەند بابەتێکم بۆ باسکرد بۆ ئەوەی هێوری بکەمەوە.

پاش ماوەیەك ئارام بووەوە وتم:

– ئێستا گوێبیستی باسەکانت دەبم، دەتوانیت دەست پێبکەیت".

فارووق بە وتنی:

– ئەمڕۆ لە وردەکاری بابەتێکی زۆر گرنگ تێگەیشتم. چووە ناو باسەکەوە. "چۆن بووە کە تا ئەمڕۆ سەرنجم لەم بابەتە نەداوە. لەبەر ئەوە زۆر لە خۆم تووڕە دەبم".

وتم: "منیش خەمە، ئەو بابەتە چییە، دەمەوێت گوێ بیستی بم".

بە نیگا گەرم و گوڕەکەیدا دیارە، دەبێت لە بابـەتێکی زۆر گـرنگ تێگەیشتبێت، بە سەرسوڕمانەوە لە خاڵێـك ڕامـاو، نـاخی هەڵڕشـت، وتی:

– مامۆستا، خەفـەت بـە هـەموو شـتێکی دەوروبـەرمان دەخـۆم، دەمەوێت لێیان بکۆڵمەوە و فێر ببم، بۆچـی ناچـینە نێـو وردەکـاری ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە خۆمانەوە هەیە؟

پرسیم: " چۆن وردەکارییەك؟"

تەواو بە جۆش و خرۆشەوە وتی:

– نازانم لە کوێوە دەست پێبکەم.

پاش ماوەیەك بەردەوام بوو وتی:

– مامۆستا، خوای پەروەردگار ئێمەی بەشێوازێکی ناوازەو ڕێك و پێك بەدیهێناوە، بەڵام هەستی پێناکەین.

وتم: "پیرۆزباییت لێدەکەم کە گەیشتویتە ئەم بیرکردنەوەیە".

– بە داخەوە تازە بەمە گەیشتووم. بەدڵنیاییەوە ئەویش بەهۆی ڕووداوێکەوە...

فارووق درێژەی بە قسەکانیداو وتی:

– دایکی باوکم بەهۆی بەرزی فشاری خوێنەوە تووشـی ئیفلیجـی بوو. چاوەکانی کراوەن، بەڵام نابینن. گوێچـکەکانی ئاسـایین، بـەڵام نابیسـتن، زمانیشـی دەجووڵێـت، بـەڵام ناتوانێـت بـدوێت. ناتوانێـت دەستەکانی بجووڵێنێت، ناتوانێت هەڵسێتە سەر پێکانی و بڕوات.

بۆچی ئێمە هەست ناکەین کە خوای پەروەردگار چەندین ئەندامی ناوازەی پێ بەخشیوین و، لە چوارچێوەی سیستەمێکی سەرسوڕهێنەرو ئەندازەکارییەکی بێ وێنەدا ئێمەی بەدیهێناوە کە ژیری پەی پێنابات. ئێمە هەست بەوە ناکەین کە لە ناو نازو نیعمەتێکی بێشوماردا دەژین.

مامۆستا، بیربکەنەوە ئەگەر چاوەکانمان نەبینن، ئامادەین هەرچیمان هەیە بیبەخشین تا ببینە خاوەنی یەك چاو. باشە، بەرامبەر بە یەك چاو چەندە سوپاسی پەروەردگارمان دەکەین؟ ئەگەر گوێکانیشمان نەبیستن، بۆ ئەوەی ببینە خاوەنی یەك گوێ، هەموو هۆکارێك دەگرینە بەر، باشە بەرامبەر بەوەی خوای گەورە گوێی پێ بەخشیوین، چی دەکەین؟ ئەگەر ژیریمان لەدەستدابێت و وەك شێت لەم نێوەدا بسوڕێینەوە، کەسێکیش مێشکێکی تەندروستمان پێ ببەخشێت، دڵنیام لەوەی کە خۆمان دەکەین قوربانی بۆ ئەو کەسە، بەڵام بەرامبەر خوای پەروەردگار کە مێشکی پێ بەخشیوین چەندە ئەرکی بەندایەتی جێبەجێ دەکەین.

سەرنج لە هەموو ئەندامەکانم دەدەم، کە لە چوارچێوەی سیستمێکی ناوازەدا هەر خانەیەو ئیشی خۆی بە جێدەهێنێت.

بەرامبەر بەو زاتەی کە هەموو ئەم نیعمەتانەی پێ بەخشیووین، پێویستە چی بکەین و چۆن ئەرکی بەندایەتیمان جێبەجێ بکەین؟ بەرپرسیارێتی مرۆڤ زۆر قورسە.

بۆ کڕینی بوکە شوشەیەکیش دەبێ پارە بدەین، هەرچی پارەو توانامان هەیە بەشی بەدەستهێنانی ئەندامەکانی جەستەمان ناکەن، کەواتە چۆن سوپاسگوزار نەبین بەرامبەر بەو زاتەی کە هەموو ئەو ئەندامە ڕێك و پێك و گونجاوەی پێ بەخشیوین؟ بە ڕای من گرنگترین بابەت کە مرۆڤ پێویستە بیری لێ بکاتەوە دەبێت ئەمە بێت.

فارووق لە بابەتێکی زۆر گرنگ تێگەیشتبوو، کە تایبەت بوو بە بیرکردنەوەو تێڕامان بەمەبەستی تێگەیشتن لە ئامانج و ئەرکی مرۆڤ لەژیاندا.

فارووق بە گەرم و گوڕی بەردەوام بوو لە باسکردنی وردەکارییەکان.

باوکم نەنکمی نەخۆشخانە بە نەخۆشخانە گێڕا. بردی بۆ لای پزیشکە پسپۆڕەکان، پارەی زۆری خەرج کرد، هەموو ئەم زەحمەتانە بەس نەبوو بۆئەوەی بتوانێ هەڵسێتە سەر پێ. لە کۆتاییدا وتیان بیبەنەوە با پشوو بدات، شتێك نەماوە بۆی بکرێت، ئێستا چاوەڕێی ڕۆژی کۆچکردنەکەی دەکەین .

ئەم بابەتە هانیدام بیربکەمەوە چاوێك کە نەبینێت، گوێیەك کە نەبیستێت و زمانێك کە نەتوانێت گۆ بکات و، بەناوبانگترین پزیشکەکانی دونیاش نەتوانن چاکی بکەنەوەو، بڵێن:" هیچ

شتێکمان له دهست نایهت". ههموو ئهمانه بهڵگهن لهسهر ئهوهی که لهسهروو مرۆڤهوه هێزێك ههیه که ئهمانه دهکات.

کار به ئهوهندهش تهواو نابێت. لاشهیهکی بهنرخ و بههادارمان پێدهبهخشێت و، هاوکات پێویستیهکانی ئهو لاشهیهش دهنێرێته دونیاوه؛ (خواردن و، خواردنهوهو، ههموو ئهو شتانهی که تام و خۆشی لێ وهردهگرین)... ههموو ئهمانه بهبێ بهرامبهر و به خۆڕایی دهبهخشێت.

باشه مامۆستا، ئهم نیعمهته زۆر بێ کهموکوڕی و نهژمێردراوانه بهخۆڕایی دهدرێت؟

ڕاستهوخۆ تهماشای ئهو فاروقهم کرد که له ناخهوه بهههستێکی شیرین و پاکهوه باسی ئهو ووردهکارییانهی بۆ دهکردم که تازه پێیان گهیشتبوو.

وتی: مامۆستا ئێمه زۆر سپڵهین، چۆن بیر لهم نیعمهته زۆر و له ئهندازه بهدهرانه ناکهینهوهو خۆمان به شتانی لاوهکییهوه سهرقاڵ دهکهین؟

باوهڕم وایه که لێپرسینهوهی ئهمه زۆر قورسهو، سزاکهشی زۆر توند دهبێت.فرمێسك به چاوهکانیدا ڕێچکهی بهستبوو.

ئهو فاروقهی که ههموو کارێکی به جۆش و خرۆشهوه ئهنجام دهدا، ئهم جاره له پێش بابهتانێکی زۆر گرنگدا دهترسێت و دهگری .

بەڵام ترسانی لەو جۆرەی زۆر لێدێت، لەبەر چاوم گەورەی دەکات و، سەرسوڕمانم بەرامبەری زیاد دەکات. بە تەواوبوونی قسەکانی فاروق، ئەو کتێبەی کە لەسەر مێزەکە دامنابوو کردمەوە و دەستم کرد بە خوێندنەوەی:

" ئەی ئەو کەسەی خۆت بە مرۆڤ دەزانیت! خۆت بخوێنەرەوە! مەگەر دەکرێت گیانلەبەرو بێگیانەکان ببنە مرۆڤ".

...تۆ بەبێ هودە نەخولقێندراویت، چونکە لەم میوانخانەییەی دونیادا هیچ شتێك بەبێ مەبەستو، بەبێ یاسا نابینیت، کەواتە تۆ چۆن دەتوانیت بێ مەبەست و بێ یاسا بیت؟

... مرۆڤ جڵەوی بۆ بەرەڵا نەکراوە تا چۆن و لەکوێدا دەیەوێت بەسەربەستی ڕابوێرێت. بەڵکو کردارەکان لەسەر تۆماردەکرێن و وێنەیان دەگیرێن و، هەرچی دەکات دەنووسرێت، تاکو لە ئەنجامدا بەرپرسیاری کردەوەکانی بێت.". [١]

لەسەر ئەم بیرکردنەوە جوانەی پیرۆزبایییم لە فاروق کردو، خودا حافیزیم لێکرد. چونکە منیش زۆر سوودم لەو وردەکارییانە بینی کە لێیان تێگەیشتبوو.

---

١- کتێبی (وتەکان)– بە زمانی کوردی/ نووسینی م. سەعیدی نورسی، لاپەڕە ١٠٩

## ژیان بۆ من
## ڕابواردن و خەوتن بوو

مامۆستای بەڕێزم:

پێشـــەکی سوپاســـتان دەکـــەم کـــە بەوپـــەڕی دڵســـۆزی و لەخۆبوردنەوە بوونەتە یارمەتیدەرو ڕێنیشاندەرم.

پێشتر بەڵێنم دابوو کە بەردەوام نامـەتان بـۆ بنووسـم، بـەڵام بـە جۆرێك بوار نەبوو. لە کۆتاییدا چارەنووس ئەمڕۆ بوو. دایـك و بـاوکم خەڵکی بینگۆلن. لە ساڵی ١٩٨٩ دا گواسـتمانەوە بـۆ ئیسـتەنبوڵ و، من لە منداڵییەوە هەر لـە ئیسـتەنبوڵم. بـاوکم بازرگانـە، دایکـم ژنـی ماڵەوەیە. پێنج خوشك و براین؛ ٣ کچ و، ٢ کوڕ. خوشـکێکی گـەورەم هاوسـەرگیری کـردووە، دوو بـرام دەخـوێنن، خوشـکە گـەورەکانی تریشم کار دەکەن، منیش دەچم بـۆ خوێنـدنگا. ئێسـتاش دەمـەوێت بچمە ناو بابەتەکەوە.

تا ئێستا هـیچ ناڕەحەتییـەکم نـەبینییوە. هەرچـییەکم ویسـتووە بووە، بەڵام ئەمە من دڵخۆش ناکات. هەمیشە لە ناخمـدا هەسـت بـە

کەساسیو دڵشکاوی دەکەم. سەرقاڵی گەڕان بووم بەدوای دۆزینەوەی بیروباوەڕدا کە سەرەنجام بەرەو هاوبەش دانانی بردم. لەبەرئەوەی بیرم لە بابەتە زۆر قوڵەکان دەکردەوە و وەڵامم دەست نەدەکەوت، باوەڕم دابەزیبوو بۆ سفر. هاوڕێکانی دەوروبەریشم باش نەبوون.

لە ڕووی باوەڕەوە ژیان بەلای منەوە بە تەنها بریتی بوو لە نان خواردنو، ڕابواردن و خەوتن. بیرم لە هیچ شتێکی دیکە نەکردەوە. لە قۆناغی خوێندنی ئامادەییمدا (ئازادی بیرکردنەوە) لای من لە هەموو شتێ گرنگتر بوو هەموو مرۆڤێکی دیندارم بە کۆنەپەرست لە قەڵەم دەدا. کاتێ لە خوێندنگا بووم زۆر حەزم لە وانەی فەلسەفە دەکرد. لەگەڵ مامۆستای فەلسەفەدا بیروڕاکانمان گونجابوو، ئەویش ژیانی ئازادی دەخواست، ئێمەش بەردەوام پرسیارمان ئاڕاستەی مامۆستاکەمان دەکرد و داوای وەڵامەکانیانمان دەکرد ئەویش بێ ئەوەی لە خۆی تێکبدات پرسیاری دیکەی ئاڕاستەی ئێمە دەکرد. ئێمەش دەچووینە بیرکردنەوەی قووڵەوە. مامۆستامان بە ڕاست دەزانیو، ڕاکانی بەلامانەوە ژیرانەبوو.

ژمارەیەکی دیکە لە مامۆستاکان کە باوەڕیان لاوازبوو. بەتایبەتی مامۆستای ئەدەبیات هەموو کات پرسیاری لێدەکردین، هەمیشە پێویست بوو قسەکانی ئەو ڕاست بن، چونکە ئێمە مافی ئەوەمان نەبوو ڕەخنە بگرین. بەتێبینی هەڕەشەی دەکرد. لەبەرئەوە هیچ

کەس نەیدەتوانی ڕووبەڕووی ببێتەوە. دواجار ڕاوبۆچوونی ئەو مامۆستایانە کاریگەری زۆریان هەبوو لەسەر بیرکردنەوەکانم و بەرەو ژیانی ئازادیخوازی ئاڕاستەیان کردم.

ئەندامانی خێزانەکەشم هەرچەندە لەڕووی دینەوە بە تەواوی بەهێز بوون‌و، ئەرکەکانی دینیان بەجێدەهێنا، بەڵام هیچ کاتێك لەمنیان نەدەپرسییەوە. ئەمەش زیاتر بووە پاڵنەر بۆم تا لە گۆشەی بیروڕاوە تووشی لادان ببم.

خوێندنگام تەواو ببوو. پێویست بوو ئامانجێك بۆ خۆم هەڵبژێرم. یان دەبوو لە خوێندنگە بەردەوام بم یان کار بکەم. لە دەوروبەر دوور کەوتمەوەو تەنها بووم، ئەوەش منی هۆگری کتێب خوێندنەوە کرد. دەستم کرد بە کتێب خوێندنەوە.

کتێبێك تەواو دەبوو، دەستم دەکرد بە خوێندنەوەی کتێبێکی تر. بەڵام نەمدەتوانی ئەو کتێبانە بەدەست بخەم کە دەمویست.

ڕۆژێکیان لە ماڵەوە کتێبێك هاتە بەرچاوم. کتێبێکی بەڕێز مامۆستا فەتحوڵا گولەن بوو. لە سەرەتادا نەمویست بیخوێنمەوە. گۆڕانکاری لە بیرکردنەوەکانمدا دەستی پێکردبوو. لە گفتوگۆیەکدا خوشکە گەورەکەم بەشداری کرد و، وتی کە چیرۆکی ژیانی (محمدی دوزجەیی) و بیروڕاکانی لێکچوون لەگەڵ هی مندا، لە کتێبخانەکە پێشکەشی کردم. لە سەرەتاوە نەمویست ئەم کتێبەش بخوێنمەوە،

بەڵام هێزێك منی ئاڕاستەی خوێندنەوەی كرد و خوێندمەوە. زۆر کاری کردە سەرم، ئەو شەوە تا بەیانی نەخەوتم.

پاش خوێندنەوەی کتێبەکە کەوتمە ناو بیرکردنەوەی قووڵەوە. ئەم کتێبە زۆر منی هەژاند. "هەمان ئەو بیروڕایانەی کە من هەمبوون و هەمان ئەو پرسیارانەی کە دەمپرسین". بەلای منەوە شتێکی باوەڕپێنەکراو بوو. ئەو ئێوارەیە تەوبەم کرد. ئەو ڕۆژە بۆ یەکەمجار باوەڕم بە خوای پەروەردگار هێنا. بە درێژایی ئەو هاوینە نزیکەی ٣٠ کتێبی دینیم خوێندەوە .

لە کتێبەکانتاندا چیرۆکی زۆر سەرسوڕهێنەری ژیان هەن. زۆر کاریگەرییان هەبوو لەسەرم. کتێبەکانی (محەمەدی دوزجەی، ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگەڕێت، خۆمم دۆزییەوە، ژیانێکی نوێ)م خوێندەوە. هەمووشیان یەك لە یەکتری باشترن. ئەگەر خودا بیکاتە قسمەتم ئەوانی تریش دەخوێنمەوە. ژمارەی تەلەفۆنەکەتانم لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە وەرگرت و خێرا پەیوەندیم پێوە کردن. لەو ڕۆژەوە تا ئێستا دەڵێم نامەتان بۆ دەنووسم، بەڵام قیسمەت وابوو کە ئەمڕۆ بینووسم. دەبوایە چاومان بە یەکتر بکەوتایە، بەڵام بەجۆرێك ڕێکنەکەوت. مامۆستا ئیشەڵا ڕۆژێك چاومان بە یەکتر دەکەوێت.

ئەگەر لە دەوروبەریش دانەبڕێم و کتێبەکانی (بەدیعوززەمان) نەخوێنمەوە ئەوا ئێوە دەورێکی گەورەتان هەبووە. ئەگەر

کتێبەکانی تۆم نەخوێندایەتەوە لەوانەیە بەردەوامیم بە بیروڕا کۆنەکان بدایە. خوا لێت ڕازی بێت مامۆستا گیان، بەهەشت شوێنت بێت. لە خوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە کە کتێبەکانتان ببێتە مایەی هیدایەت بۆ کەسانی وەکو من.

پاش ئەو دابڕانەم لە دەوروبەرەکەم شێوازی ژیانم زۆر گۆڕا. دەچوومە ناو کۆڕو گفتوگۆوە و، دەستم کرد بە خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور. خۆشەویستی ناخم بەرامبەر بە مامۆستا نوورسی زیادی کرد، وێنەکەی لەو ماڵە هەبوو کە بۆ وانە خوێندن بۆی دەچووم. داوای وێنەیەکیم کرد بۆ خۆم. پێیاندام و هەڵمواسی بە مێزی کۆششکردنەکەمەوە پاشانیش لێمکردەوە و بەکتێبخانەکەدا هەڵمواسی، چونکە کە تەماشای ئەو وێنەیەم دەکرد وەك ئەوە وابوو بیەوێ شتێکم بۆباس بکات، بەردەوام ئامۆژگاری تێدا دەبینرا. لەوانەشە من وام هەست کردبێت. دەمویست ببمە قوتابی مامۆستا سەعیدی نوورسی بەڵام خۆم بە شیاو نەدەزانی، پشووی هاوینم بە خوێندنەوەی کتێب و چارەسەرکردنی پرسیارە دینییەکانمەوە بەسەر برد.

دوای ئەوەی خوێندنگا کرایەوە، دەستم کردەوە بە کۆشش کردن لە وانەکانمدا. سیستمی وانەی ڕابەرایەتی خوێندنگاکەم زۆر بەدڵ بوو. گرنگی بە پرسیاری هەموو خوێندکارەکان دەدا و وەڵامی پرسیارەکانیانی دەدایەوە. لە ماوەیەکی کورتدا دیمانەیەکم لەگەڵ مامۆستای ڕابەرایەتیدا سازکردو بووینە هاوڕێ. لە بابەتە

دینییەکانـــدا زۆر یارمـــەتی دەدام. هـــەوڵێکی زۆری لەگەڵـــدام لـــە فێربوونی نوێژدا.

دەستمکرد بە نوێژکردن، تەنانـەت ئەگـەر بـە مانـا تـەواوەکەشـی نەبێت نوێژکردن فێربووم. کاتێ ئێواران دەخەوتم بیرم دەکـردەوە و لەناخمدا دەنگێك پێی دەوتم:" شەو لە خەونتـدا کەسـێکی بەتـەمـەن دەبینیت". بەڵام دەموت ڕەنگە ئەمە خەیاڵ بێت. ئـەوەبوو شـەوێك بەڕاستی لە خەونمدا کەسە بەتەمەنەکەم بینی، هاتبوو بۆ لای ئێمـە. بوختانیان بۆ هەڵدەبەست، کەس ئەوی لەخۆ نەدەگرت، لەبەرئەوەی لە بەندیخانە دەرچووبوو. دەرگاکەی ماڵی ئێمە کراوەبوو، هاتە ماڵی ئێمە. لە ژوورەکەدا لەگەڵ ماممدا بەرامبەر بەیـەك دانیشـتن. منـیش لە کەلێنی دەرگاکـەوە تەماشـام دەکـردن. ڕووی کـردە مـن و وتـی: "پاش دوو ساڵی دیکە دەمریت".

خەونێکی سەرسوڕهێنەربوو، ئەو کەسەم دەناسی لـە خـەونەکـەدا بینیم، مامۆسـتا (سـەعیدی نوورسـی) بـوو. زۆر سەرسـوڕهێنەر بـوو شـەو کـاتێ خـەوتم وەك ئـەوەی کەسـێك پـێم بڵێـت خـەونێکی لـەو شێوەیە دەبینیت .

بەیانی کە بەخەبەرهاتم بۆم دەرکەوت ئـەو دەنگـەی شـەو ڕاسـت دەرچوو. بەڕاستی لە خەونەکەمدا کەسێکی بەتەمەنم بینـی، ترسـێك کەوتـە ناخمـەوە. خـەریك بـوو لـە هـۆش خـۆم بچـم. لـەتاوا گریـام. تەمەنم ١٨ ساڵە. هێشتا شتانێك هەن کە دەبێـت ئـەنجامیان بـدەم.

لەڕاستیدا لە مردن ناترسم، چونکە دەچم بۆ لای ئەو کەسانەی خۆشم دەوێن، بەڵام لەوە دەترسم کە خۆمم ئامادە نەکردووە. ئێستاش خشتەیەکم داناوە بۆ جێبەجێ کردنی کارەکانی ڕۆژانە: چوار کاتژمێر بۆ خەوتن و یەك کاتژمێر بۆ (٢) ژەم نان خواردن و شەش کاتژمێر بۆ سەعیکردن لەوانەکانمداو ئەوی تری بە عیبادەتەوە بەسەر دەبەم. ئەگەر لە زانکۆ وەربگیرێم ئەوا پشتیوان بەخوا لەو بوارەدا خزمەت دەکەم.

"دواجار دەمەوێت بڵێم کە لە نامە نووسیندا لێهاتوو نیم، لەوانەیە نووسینەکەم کەموکوڕی زۆری تێدابێت، هیوادارم بەڕێزتان چاوپۆشی لە هەڵەکانم بکەن "ژیان یاسایەو، نووسین سەرفرازییە".

لە کورتترین ماوەدا چاوەڕێی نامەتان دەکەم. لە ئامانەتی خوادا بن.

**فاتمە ئیشك**

# ئافرەتێکی گەڕاوە لە خۆکوشتن



مامۆستای بەڕێزم:

ئەوەی ڕاستی بێت لەسەرەتادا زۆر دوودڵ بووم نەمدەزانی ئەم نامەیە بنووسم یان نا، لە پاشاندا بە هاوکاری هاوسەرەکەم، بڕیارمدا بینووسم، بۆئەوەی کچە لاوەکان پەندی لێوەربگرن.

ژیانێکی زۆر بێماناو ناشیرین دەژیام کە لێرەدا نامەوێ ئاماژە بە وردەکارییەکانی بکەم، بەڵکو دەمەوێت پەیامێکی تایبەتی ئاڕاستە بکەم، بەهیوای ئەوەی ئەو کەسانەی کە وەك من لەکێشەدا دەژین و گیرۆدەبوون بەدەستی کۆمەڵگای بێبەزەییەوە گوێیان لەم دەنگە بێت و سوود لەم بەسەرهاتە وەربگرن. ئومێدەوارم ئەو کەسانەی لە ژیان بێزاربوون و، بیر لە خۆکوشتن دەکەنەوە، جارێکی دی بگەڕێنەوە بۆ ژیان و لەپێناو بەختەوەری و ئاسوودەییدا تێبکۆشن. دەخوازم منیش بە نووسینی ئەم نامەیە ئەرکی سەرشانی خۆم جێبەجێ کردبێت.

هەڵبەت هەموو مرۆڤێك لەژیاندا بەچەندین وێستگەی جۆراوجۆردا گوزەردەکات و ڕووبەڕووی زۆر ڕووداوی خۆش و ناخۆش دەبێتەوە. منیش وەك هەر مرۆڤێك لەیەکێك لە قۆناغەکانی ژیانمدا دووچاری قەیرانی دەروونی بووم.

زۆر دڵتەنگ بووم، وامدەزانی هەموو دونیا بەسەر مندا ڕووخاوە، خۆشیم لە هیچ شتێك وەرنەدەگرت. خۆم لە خزم و دۆست و هاوڕێکانم دەدزییەوە، چونکە وامدەزانی هەموو ساتێ هەڵەکانم دەدەنەوە بە ڕوومدا .

لە قەیرانێکی دەروونی سەختدا دەژیام، زۆر بەخێرایی کەسەکانم دەشکاند. حەزم نەدەکرد بچمە ژێر فەرمانی کەسەوەو ئامۆژگاری وەربگرم. بووبوومە فیدای هاوڕێ نیاز خراپەکان. هەموو بەها جوانەکانم لەدەستدا.

بۆئەوەی لەسەر تاوانەکانم سزا نەدرێم و لێپرسینەوەم لەگەڵ نەکرێت، باوەڕم لەدەستدا، باوەڕم وابوو کە خودا و دوارۆژ بوونیان نییە، یاخود دەمخواست بەو شێوەیە بێت.

ئەو کەسە دیندارانەشی کە دەمناسین، لەجیاتی خۆشەویستی و ڕووخۆشی بە سزا و ترساندن لێم نزیکدەبوونەوە. وەك ئەوەی دین ناوەندی سزا و بەندیخانەو، خوداش هێزێکی بێ بەزەیی بێت.

ئەم جۆرە بیرکردنەوەو تێگەیشتنە هەڵانە تەواو بێزاریان کردبووم. وامدەزانی هەموو شتێك تەواوبووە، بۆیە بڕیارمدا بیر لە

خۆکوشتن بکەمەوە. بەخۆمم وت: "پێویستە ئەم ژیانە کۆتایی پێبێت، چونکە تەنها مایەی ئازارە بۆ من".

باوکم لە ماڵ دەریکردم و وتی: "ئیتر تۆ بوویتە کچی کۆڵان!"... دایکیشم نەبوو کە بەدوامدا بگەڕێت و، لێم بپرسێت و، دەستم بگرێت.

ئەوەبوو ڕۆژێك مامۆستا سیبێڵ مامۆستای زانستی هونەری قۆناغی ناوەندیم لەبەرامبەرم دەرکەوت. خوایە گیان تۆ چەندە مەزنی. هەرگیز ستەم لە بەندەکانت ناکەیت، بەزەییت هەموو دونیای داپۆشیوە.

چۆن گەڕامەوە بۆ ژیان؟

ناتوانم باسی بکەم:

مامۆستا سیبێڵ ئاگاداری ئەو ڕووداوانە بوو کەبەسەرم هاتبوون. بەڵام نەیهێشت من هەست بکەم. تەنانەت دەیوت تۆ لە کچە سەرکەوتووە سەرڕاست و خۆشەویستەکانی قوتابخانەیت، منیش لە ناخمدا پێدەکەنیم و ڕامدەبوارد.

وەکو دایکێکی بەسۆزو میهرەبان گرنگی پێدەدام ... ڕۆژانە لە ماڵەکەیدا سەنگین دەبووم، بەیەکەوە دەڕۆیشتین و کارمان دەکرد.

خوای گەورە ڕەحمی پێکردم و نووری شادیی خستە دڵمەوە. دونیامی ڕۆشنکردەوە.

مامۆستا سیبێڵ یەکەمجار کتێبەکانی ئێوەی پێدام (ئەو پیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت، خۆمم دۆزییەوە، محەمەدی دوزجەیی) و

ئـەوانی دیکـە... پاشـان پەیامـەکانی نـووری مامۆسـتا (سـەعیدی نوورسی) پێدام.

هەڵبەت لەم دونیا بێزارکەرەدا بەهەشتێکیش هەیە، بـەڵام ئێمـەی مرۆڤ زۆرجار ئاگادارنین...

ئەگەر لە کۆتـا بـارودۆخم دەپرسن، ئـەوا زۆر دڵخۆشـم. کەسـێك دەرکەوت کە منی پەسەند کرد. هاوسەردارم. یەکـەم منـداڵم کۆچـی دوایـی کـرد، بـووە چـۆلەکەی بەهەشـت. ئێسـتا لەگـەڵ منـداڵی دووەممانـدا (زەهرا نوور) بە خۆشی ژیان دەبەینەسەر .

زۆر دۆعات بۆ دەکەم. یاخوا خامەت بە برشت بێت.

**خوشکت، ئەسرا گیونێش**

# تەنانەت بیرم لە خۆکوشتن کردەوە



مامۆستای بەڕێزم:

من تەمەنم ٢١ ساڵە، دەرچووی ئامادەییم. لە ئەکچای سەر بە باڵك ئەسیر کە شوێنێکی بچووکی نیشتەجێ بوونە لە کەنار دەریا دەژیم. تا ئەمڕۆکەش بەبێ هودە ژیان بەسەر دەبەم و ئیسلامییەتیم پەسەند نەکردووە. کەسێکم بە دڵ و گیان باوەڕم بە بوون و تاك و تەنهایی خودا هەیە، بەڵام تا ئێستا ئەوەی پێی دەڵێن نوێژ کردن و ڕۆژوو گرتن ئەنجامم نەداوە.

تا ئەمڕۆ خۆمم داوە بە دەم کاری بێ سوودەوە و بەپێی پێویست لە دینەکەم شارەزانیم. تەنانەت بێ ئەوەی بیر لە داهاتوو و قیامەت بکەمەوە، تا هەنوکەش لەنێو سەرکێشییەکانی گەنجێتیدا دەژیم. لە هەڵسوکەوت و فەلسەفەی ژیاندا لاسایی ئەوروپا دەکەمەوە. لەژیانمدا زۆر کەسێکی سەرەڕۆم و هەڵەی زۆرم

ئەنجامـداوە، تەنانـەت جارێـك كـار گەیشـتە ئـەوەی كـە بـیر لـە خۆكوشتن بكەمەوە، سەرەتای ئەم ڕووداوەش بەمجۆرە بوو:

ڕۆژێكیـان لەگـەڵ كەسـێكدا یـەكترمان ناسـی و خۆشـم ویسـت. هــەموو شــتێك زۆر بــاش بــوو. پاشــان لەبــەر هەنــدێ هۆكــار جیابووینەوە. من پاش جیابوونەوەكە زۆر گۆڕام. خـووم دایـە مـەی خواردنەوە. مەیلی خۆكوشتنم دەكرد، بەڵام نەمتوانی خـۆم بكـوژم. پاشان خێزانەكەم بۆ ئەوەی من لە ئاكچـای دووربخەنـەوە ناردمیـان بۆ ماڵی خوشكەكەم. زاواكەمان و خوشكە گەورەكەم لە گدیز سەربە كوتاهـ دەژین . هاتمە گدیز، زاواكەمان كەسـێكی دینـدارە. پزیشـكە. كێشەكانمم بۆ باسكرد و پـێم وت كـە لـە گەڕانـدام و لـە دووی خـۆم دەگەڕێم .

كتێبەكەی تۆی بە ناوی "ئەو پیاوەی لە دووی خـۆی دەگـەڕێت" پێـدام خوێندمـەوە. پاشـان كتێبـەكانت بـە ناوەكـانی "محەمـەدی دوزجەیی" و "ژیانێكی نوێ" م خوێندەوە. بـەهۆی كتێبەكانتانـەوە بە حەزرەتی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسـی ئاشـنا بـووم، چـونكە تـۆ هەمیشـە بـاس لـەو دەكـەیت و دەربـارەی پەیامـەكانی نـوور لـە زاواكـەمانم پرسـی. كتێبێكـی خـۆیی پێـدام، كـە بـاس لـە ژیـانی حەزرەتی سەعیدی نوورسی دەكات، خوێندمـەوە. پاشـان پرسـیارم كـرد كـە ئایـا خـۆی پەیامـەكانی نـووری هەیـە یـان نـا. كتێبـی "وتــەكان"ی پێــدام . بــا زۆر درێــژەی پێنــەدەم، لــە ناخمــدا پەشـێوییەكی زۆر گـەورە هەیـە. دەمـەوێت بگـۆڕێم بـەڵام نـازانم لـە

کوێوه دهست پێ بکهم و بڕیارمدا ئهم نامهیه بۆ تۆ بنووسم. وابـزانم تهنها تۆ دهتوانیت یارمهتیم بدهیت...

مامۆستا، له کوێوه و چۆن دهست پێبکهم. چۆن ڕابـردووم لـهیاد بکهم و سهرلهنوێ بهئاسوودهیی بژیم. چۆن ههوڵی گۆڕانکاری بـدهم و لــهکاری ههڵــهو بێســـوود دوور بکهومـــهوه. لــهم ســهردهمهدا موسوڵمانان لهژێر فشـارێکی زۆردان. فهلسـهفهی مـاددی کاریگـهری سـلبی ههیـه لهسـهر مێشـکی هـهموو تـاکێکی کۆمـهڵگاو زۆرێـك لـه کهناڵهکانی ڕاگهیاندن و ناوهنـده کۆمهڵایهتیـهکان هـهوڵ دهدهن بـۆ ئهوهی کاریگهری لهسهر کچـان و کـوڕان دروسـت بکـهن و، گـهنجێك بهرهــهم بێـنن کـه شوناسـی خـۆی ون کردبێـت و بووبێتـه کۆیلـهی حهزوئارهزووهکان.مامۆسـتای بـهڕێز لـه سـهردهمێکی وههـادا چـۆن خۆم کۆنترۆڵ بکهم و لاپهڕهیهکی نوێ لهژیانـدا ههڵبدهمـهوهو، وهك موسوڵمانێکی ڕاستهقینه بژیم.

مامۆستا گیان، لهو بابهتهدا یارمهتیم بدهن که له کوێـوه و چـۆن دهست پێ بکهم، چۆن له دونیادا خۆم له ههڵهو تاوان بپارێزم، چۆن لهســهرهتاوه دهســت بکــهم بــه دینــداری. ڕێگـام نیشـان بـده، مـن چاوهڕوانی نیشانهکانی حهزرهتی بـهدیعوززهمان سـهعیدی نوورسـی دهکهم، لهو بڕوایهدام دهبێته یارمهتیدهرم.

لهگهڵ ڕێز و خۆشهویستیمدا...

ئێرۆمن یهشیل

# خۆم دەکوشت



مامۆستای بەڕێزم:

نزیکـەی کاتژمێرێکـە پێنووسـم بـە دەسـتەوەیەو، کاغـەز لـە بەردەممدایـەو، بـەلای مێزەکـەوە دانیشـتووم. دەمـەوێت نامـەت بۆ بنووسم، بەڵام نازانم چۆن دەست پێبکەم.

لەناو سەرسوڕهێنەرترین جۆش و خرۆش و ترسدام. بـڕوا بکـە لـە پەشۆکاویدا پێنووسەکەم بۆ ناگیرێت.

چـیرۆکی ژیـانم پـڕە لـە لادان و سـەرەڕۆیی، کـاتێ هـەر بەسـەرهاتێکی ئـەو ژیانـەم بیردەکەوێتـەوە هەسـت بـە غـەمباری دەکەم.

کاتێـک دەمـەوێت بەشـێك لـەو بەسـەرهاتانە بخەمـە سـەر کاغـەز دەترسم لەوەی کە گومانت هەبێت لە قسـەکانم، بـەڵام پێویسـتە لـە شـوێنێکەوە دەسـت پـێ بکـەم، چـونکە تـازە بڕیـارم داوە ئەگـەر قورسیش بێت. پێویستە ڕووداوە سەیرەکانی ژیانمت بۆ بـاس بکـەم

بۆ ئەوەی کەسانی دوای خۆم پەندی لێ وەربگرن، چونکە ئەمە بەرپرسیارییەکی گرنگ و تەنانەت ئەرکێکی بەندایەتییە.

هیوادارم بەهۆی ئەو ڕووداوانەی کە باسیان دەکەم، بە چاوی هەڵە سەیرم نەکەن و بەکەسێکی درووپووم لە قەڵەم نەدەن، چونکە ئەوەی نووسیومە ڕاستە و ڕوویداوە و تیایدا ژیاوم.

من لە کریککالدا هاتوومەتە دونیاوە. خێزانەکەمان لە نەبوونیدا بوون. باوکم لەداخی هەژاری دەستی دابوویە مەی خواردنەوەو بێئیش دەسوڕایەوە.

دایکم لەدەست بێ ئیشی و مەی خواردنەوەی باوکم زۆر تووڕەبوو، لەبەر ئەوەش بەردەوام شەڕ و دەمەقاڵەیان بوو.

باوکم لەلایەك لەبەر هەڵەکانی خۆیو، لەلایەکی دیکەشەوە لەبەرئەوەی دایکم زیاد لەسەری دەڕۆیشت ماڵی بەجێهێشت، وتی: "دەچم بۆ ئەڵمانیا"، سەرەڕای ئەوەی ٢٦ ساڵ تێپەڕیوە هێشتا نەگەڕاوەتەوە. کەس نییە هەواڵی بزانێت کە ئایا چی بەسەر هاتووەو، چی دەکات، دەژی یان مردووە. هەرچەندە ئەمە دەبێتە درامایەکی زۆر جیاوازی زنجیرە ڕووداوی ئازاری ژیانم، هێشتا دڵم بەردەوامە لە کڕووزانەوە.

بەبێ باوك گەورەبوون چەند زەحمەتە.. خودایە، بەسەر کەسیدا نەهێنێت. گورگە برسیەکان فێڵبازانە چاودێری ئەوانە دەکەن کە

بەبێ باوك گەورە بوون و لە بێ هێزترین ساتدا هێرشیان بۆ دەبەن.
کۆمەڵگا پڕە لەم نموونە پڕ ئازارانە .

کە باوکمماڵەوەی جێهێشت من هێشتا پێم نەنابووە تەمەنی یەك ساڵییەوە. دایکیشم ژنێکی بەشان و شەوکەت و تەمەن ١٩ ساڵ بوو، دەرچووی قۆناغی سەرەتایی بوو. جگە لەوەش باوك و دایکی دایکیشم لە ژیاندا نەبوون.

لەبەر چەند هۆکارێك نەمانتوانی لە کریککال نیشتەجێ ببین. دایکم ژنێکی زۆر ڕەوشت بەرزو بەجەرگ و دەسەڵاتدار و خۆسەپێن بوو. لە قسەو وتەدا درێغی نەدەکرد. لەوانەشە لەبەر ئەمانە باوکم بەبێ چارەیی وازی لێهێنابێت.

بەیارمەتی خزمێکی دوورمان لە ئەنکەرە نیشتەجێ بووین. لێرەوە ناڕەحەتیەکانی دایکم دەستیان پێکرد.

مامۆستا گیان بیربکەنەوە، لە شوێنێکی وەکو ئەنکەرەدا، ژنێکی گەنجی جوان، ماڵێك و ئیشێکی ڕێك و پێك نەبێت، ئاخۆ چ مەترسییەك چاوەڕوانی بکات؟ من کە سەرەتا دونیا و مرۆڤەکانم دەناسی بەیەکەوە لەگەڵ دایکمدا لەم ناخۆشیە سەختانەدا ژیاین. تا بڵێی ژیانێکی ناخۆش و تاڵ بوو، خوایە کەس بەو شێوەیە نەژی.

دایکم هاوسەرگیرییەکی سەرنەکەوتووی کردبوو. لەبەرئەوە سووربوو لەسەر ئەوەی کە جارێکی دیکە هاوسەرگیری نەکات. هەر بەوهۆیەشەوە تووشی کێشەو ناسۆری زۆرهات.

که دەستم کرد بە خوێندنی سەرەتایی، دایکم تووشی کۆمەڵێك نەخۆشی درێژخایەن بوو، چونکە بەردەوام هەوڵی دەداو لەسەرو توانای خۆیەوە ئیشی دەکرد بۆ ئەوەی ژیانێکی شایستەم بۆ دابین بکات.

دایکم لەدەرەوە بەتواناو خۆسەپێن دەردەکەوت، بەڵام کە دەهاتە ماڵەوە تا بەیانی بەبێ دەنگ فرمێسکی دەڕشت.

ماوەیەك خەریکی خزمەتکردنی ژن و مێردێکی دەوڵەمەند بووین، بارودۆخمان کەمێك باش بووبوو، بەڵام نەیان هێشت لەوێش ئاسوودە ببین.

که گەیشتمە قۆناغی ناوەندی، باشتر هەستم بەو ئازارانە دەکرد کە دایکم دەیچەشتن، چونکە هەندێ کەس کە دەیانزانی بێ باوك و بێ چاودێرم منیشیان بێ تاقەت دەکرد.

ساڵان چوونە پێش، ژیانی منیش سەخت بوو. لەلایەك دایکم بەهۆی خراپی گوزەرانەوە دەڕۆیشت بۆ کارکردن و بەردەوام نەخۆشییەکانی پەرەیان دەسەند، لەلایەکی دیکەوە من کچێکی گەنج بووم و چەندین مەترسی دەورەیان دابووم... بە کورتییەکەی؛ زۆر تەنهاو بێچارە بووم.

کە گورگە برسییەکانی دەووروبەرم بێزاریان دەکردم، دونیام لێ دەهاتەوە یەك و بێزاریم دەردەبڕی و لە خودا یاخی دەبووم و دەموت: "لەبەرچی ئەم ناخۆشییانە هەر بۆ ئێمەیە؟"، لە ناخەوە

دەگریام. لە بنەڕەتدا خێزانەکەمان دوور بوو لە دینداری بەم هۆیەوە باوەڕپیشمان بە دڵنەواییەکی واتایی نەبوو.

لــە قۆنــاغی ئامادەییــدا لەگــەڵ ئــەم بــێ ســەرووبەرەیی و پەرتەوازییــەدا ئــالام بــە گروپــە زیــان بەخشــەکانەوە. دەســتم دایــە جگەرەکێشــان و مــەی خواردنــەوەو کۆمــەڵێك خــووی زیانبــەخش. دایکیشم زۆر نیگەران بوو بۆ ئــەو بارودۆخــەی مــن، زۆر هــەوڵی دەدا لەم هەڵسوکەوتە زیانبەخشانە دوورم بخاتەوە.

سەرەڕای هــەموو ئــەم کــارە زیانبەخشــانە، هێشــتا دروســتیم لــە دەستنەدابوو، یان بەو شێوەیە هەستم دەکرد.

بە تێپــەڕبوونی کــات، بــەهۆی ئــەو هەڵســوکەوتە زیانبەخشــانەوە هەســت و ســۆزم نــەمابوو، مەیلیشــم بــۆ "بــێ بــاوەڕیی و ڕێکخــراو و دامەزراوە چەپەکان" دروست بووبوو. وەك ئــەوەی بڵێــی -حاشــا- بەبێ باوەڕی بە خوداو بە چــوونە نــاو دامــەزراوە چــەپەکان بمــەوێت تۆڵە لە کۆمەڵگا بکەمەوە.

دایکــم بــەهۆی ســەختی ژیــان و پــەرەســەندنی نەخۆشــییەکەیەوە نەیتوانی لەوە زیاتر بەرگە بگرێــت، هێشــتا تــەمــەنی (٣٧) ســاڵ بــوو کۆچی دوایی کرد. منیش لە ژیاندا بە تەنها مامەوە.

لە ناو بێهیوایی و نائارامیدا دەژیام، هەندێ جار لەبەر بێ شــوێنی لەگــەڵ هاوڕێیــانی گروپەکانــدا دەمامــەوە، لەبەرئــەوە هەنــدێ ڕۆژ نەمدەنتوانی سەر لە دایکم بدەم. ئینجا ئەو ڕۆژەی دایکیشــم کۆچــی

دوایی کرد، یەکێك بوو لەو ڕۆژانەی کە نەمتوانی سەردانی بکەم. ئەمە منی تەواو بێزار کرد، یاخی بوونەکەم زیای کرد، دەستم کرد بە ناردنی نەفرین بۆ خۆم، بۆ کۆمەڵگا، بۆ ژیانم. خۆشەویستترین کەس، دایکم کە ژیانی خۆی کردە قوربانی ژیانی من بە تەنها جێمهێشت، لە کۆتا ساتی ژیانیدا لەلای نەبووم، ئەمە منی پەرێشان کرد.

بڕیارمدا خۆم بکوژم، بۆ ئەمەش لە ناخی خۆمدا دەستمکرد بە پلان دانان، چونکە هیچ شتێکم نەمابوو کە بمبەستێتەوە بە ژیانەوە... شوێن و ماڵم نەبوو. خوێندنم تەواو کردبوو، نەبووبووم بە دەسك بۆ تەورێك. گوێم بە ژیان نەدەدا لە نێو گروپی هاوڕێیاندا شتێکم نەمابوو لە دەستی نەدەم. بێ بڕوابووم و تەنانەت بێ بەزەیی بووم. کە بەو جۆرەش دایکم لەدەستدا...چیتر بەلامەوە گرنگ نەبوو لەژیاندا بمێنم.

شێوازی خۆکوشتنو، شوێن و ڕۆژەکەیم دیاری کردبوو. پاش دوو ڕۆژ ئەم ئیشە کۆتایی دەهات. بۆچی پاش دوو ڕۆژ... چونکە پێویست بوو ئەو دوو کەسەی ژیانی منیان زەهراوی کرد بوو تۆڵەیان لێبکەمەوەو پاکیان بکەمەوە. پێویست بوو لەگەڵ مندا دوو میکرۆب کە ژیانی پاك و پوختی مرۆڤەکانیان ڕەش کردبوو بمرن.

چووم بۆ ئەو ژێر زەمینەی کە دایکم تیایدا کۆچی دوایی کردبوو. ویستم پێش خۆکوشتن بۆ دوایین جار سەردانی ئەو شوێنە بکەم.

کـاتێ لـەناو دەرگاکـەدا وەسـتابووم دووبـارە ئـازاری ئـەو یادەوەرییانـەم بـەبیردا هاتـەوە، ئەوەنـدەی پـێ نەچـوو بـەدەنگی ژنێکی بەتەمەن هاتمەوە بە خۆمدا.

وتی: "تۆ فاتۆش نیت؟"

ئاوڕم بۆ پشتەوەم دایەوە، ئەو بوو.

هاوڕێ خۆشەویستەکەی دایکم، هاوبەشی نهێنییەکانی، پـوورە نەریمان لە قاتی سەرەوە نیشتەجێ بوو.

زۆر یارمەتی دایکمی دابوو، چەندین جـار دایکمـی بردبـوو بـۆ لای پزیشك، دەرمانـەکانی بـۆ کـڕی بـوو و زۆر یارمـەتی تـری دابـوو کـە نایانزانم، ژنێکی باش بوو.

کە لەگـەڵ پـوورە نـەریمان چـاومان بـە یـەکتر کـەوت، نـەمتوانی سەیری چاوەکانی ئەو ژنە پاك و پوختـە بکـەم. بیرمکـردەوە و وتم: "کچێکی گەنج و پیس بوو بە تاوانەکان مافی ئەوەی نییە ئەگـەر بـە تەماشاکانیشی بێت ژنێکـی نموونـەیی بەشـەرەف و فریشـتە ئاسـای وەك پوورە نەریمان پیس بکات".

بەڵام ئەو بەوپەڕی سۆزو میهرەبانییەوە منی لە ئامێز گرت.

وتی: "ڕۆڵەکەم، تۆ لـە کوێیـت؟ زۆر شـتی گـرنگ هـەن کـە بـۆتی باس بکەم. هیچ نەبێ وەرە با بچینەماڵەوە".

قۆڵمی گرت، بە زۆر منی بردە ماڵەکەیەوە کە قاتێك سەروتربوو.

لەو ماڵە خاوێنەدا خۆمم لا بێزراو بوو، وەك ئەوەی بڵێی پێم لە هەر شوێنێکدا دادەنا پیسم دەکرد.

بەرامبەرم دانیشت. سەرەڕای هەموو پێداگری و ڕێگرییەکانم خواردنی هێنا. ئەوە بۆ چەند مانگێك دەچێت یەکەم جارە (بسم الله) دەکەم و بەدڵی خۆم خواردنێك دەخۆم، هێشتا خواردنەکە بە گەروومدا نەچووبوویە خوارەوە، کەچی هەستم بە خۆشییەکی یەکجار سەیر دەکرد.

بەو هەموو خاوێنی و نییەت باشییەوە لە بەرامبەرمدا دانیشتبوو، پۆشتە، ڕووخساری وەك نوور گەشاوە، فریشتەی چاکە پوورە نەریمانی پاکوخاوێن، کاریگەرییەکی سەیری هەبوو لەسەرم لەحزووری گەورەیی ئەودا منی بچوك بچوکتر دەبوومەوە.

کە سەیری حاڵی خۆم دەکرد هەستم بە شەرمەزاری دەکرد.

ئەوەبوو لەپڕێکدا دەنگی بەرزکردەوەو وتی: "کچم ئاسوودە بە منیش لە جێگای دایکتم. بۆچی خۆت بە غەریب دەزانیت. خواردنەکەت بە باشی بخۆ. قۆریە چاکەشم لە ئاگردانەکەدا داناوە، کەمێکی تر هەم چایەکەمان دەخۆینەوە، هەم قسە لەسەر ئەو شتانە دەکەین کە دایکی خوالێخۆشبووت بۆی باسکردم".

کە وتی "خوالێخۆشبوو" دەنگی پچڕ پچڕ بوو. منیش دڵم بەخێرایی لێی دەدا. دوای چەندین مانگ ئەوە یەکەم جار بوو هەستم بە ئازارو دڵخۆشان دەکرد، چونکە پێشتر بۆ ماوەیەکی زۆر

سۆزو بەزەیی لە دڵمدا نەمابوو، هەموو شتەکان لەبەرچاومدا خراپ بوون، سڵم لە هەموو کەسێك دەکردەوەو، هەموو شوێنێکم لا تاریك بوو.

نانەکەمم خوارد. دواتر لەگەڵ پوورە نەریماندا باسی هەموو شتێکمان کرد. بۆئەوەی لە کاتی نان خواردنەکەدا من دڵتەنگ نەکات، نەهاتە سەر باسە سەرەکییەکە.

پاش ئەوەی قۆری و پەرداخەکانی لەسەر مێزەکەی بەردەمم دانا، بۆ ماوەیەك بە چاوی پڕ فرمێسکەوە لێم وردبوویەوە، وەك ئەوەی هەستی بە زریانی ڕەشبینی و خۆکوشتن کردبێت.

وتی: "کچم، لەوانەیە تۆ نەزانیت، بەڵام وەکو منداڵەکانی خۆم مامەڵەم لەگەڵ تۆو دایکی خوالێخۆشبووت کردووە، هەرگیز جیاوازیم نەکردوون. من ژنێکی نەخوێندەوارم، بەڵام خوای پەروەردگار ڕۆژانی خراپو باشیشی نیشانداوم. هەرچەندە کەسانێکی کەم دەناسم، بەڵام بە تەماشاکردنی ڕووخسارياندا، تێدەگەم لە چ بارودۆخێکدان.

فاتۆش گیان، دەزانم ژیانێکی زۆر سەختتان گوزەراندووە. هەیە نەزانێت بە تەنهاییو، بێ پارەیی چ ئازارگەلێکتان چەشتووە؟ بەڵام هێشتا کچێکی ئازا و بەجەرگیت کە لەسەر پێیەکانی خۆت ڕاوەستاویت و، هاتوویت و پەنات بردووەتە بەر یادەوەرییەکانی دایکت. هەزار ماشەڵا. ئەگەر کەسێکی تر بووایە، کێ دەزانێ کەوتبووە چ بارودۆخێکەوە".

پـووره نـەریمان ژنێکـی زۆر سـادەو دڵپـاك بـوو. هەرچـەندە بـە ڕووخسارمدا دەیزانی لە چ بارودۆخێکی خراپدام، بـەڵام وەك ئـەوەی هـیچ نـەبووبێت بـەڕێزەوە دەسـتی بەسـەرمدا دەهێنـاو بەباشـی هەڵسوکەوتی لەگـەڵ دەکـردم. ڕاسـتە کەسـێکی نەخوێنـدەوار بـوو، بەڵام بەقەدەر دەروونناسێك سەلیقەی هەبوو.

وتم: "پـووره نـەریمان تامـەزرۆی ئـەو قسـانەتم کـە دەتویسـت سەبارەت بە دایکم بیانڵێیت".

وتی: "فـاتۆش گیـان هـیچ خەفـەت مـەخۆ، دایکـت بـە شـێوەیەك وەفـاتی کـرد، کـە ئیشـەڵا خـوای پـەروەردگار ئـەو شـێوە مردنـەش دەکاتە قسمەتی ئێمەش".

وشـەی "مـردن" وەك کوتـەك دەسـتی کـرد بـە لێـدانی مێشـکم. مردن... لە مردنیشدا باشی هەیە؟ مردنو، جیابوونەوە لە دونیـا ... مرۆڤ دەبەنە نێو خاك.

باشە ئەمە کوێی جوانە؟

پووره نەریمان باسی ئەوەی دەکرد کە دایکم چـۆن بـە ئیمانـەوە کۆچی دوایی کردووه.

فاتۆش گیان، دایکت چوار مانگ لەمەوپێش لە شـەوێکی پـیرۆزدا خـەونێکی بینیبـوو. خـۆ دیـاره دایکـت بـەهۆی نەخۆشـییەوە زۆر نەیدەتوانی پەرستشەکانی ئەنجام بدات. ئەو شەوە پیرۆزە لـە مـاڵی ئێمە تا دەمەوبەیان خەریکی عیبادەت و قورئان خوێندن و پاڕانـەوە

بووین. دایکی خوالێخۆشبووت ئەو ڕۆژە لە خەونەکەیدا زاتێکی زۆر بەڕێزی بینیبوو. ئەو کەسە بە دایکتی وتبوو: "کچم، ئەجەلت نزیکە. واز لە پەرستشەکانت مەهێنە. ئیشەڵا ئەو نارەحەتییانەی کە چەشتووتن، دەبنە کەفارەت بۆ تاوانەکانت، من دوعات بۆ دەکەم".

دایکیشت وتبووی: "تاوانەکانم لە نەخۆشییەکەم زۆرترن، ئەرکی بەندایەتیم بەجێنەهێناوە. زۆر دەترسم". ئەو زاتە پیرۆزەش وتبووی:

"مەترسە کچم. لێبووردەیی خوای پەروەردگار لە ئەندازە بەدەرە، هەرچەندە هەڵەو تاوانت زۆربێت، پێویستە ڕووبکەیتە خودای پەروەردگارو، بەردەوام داوای لێخۆشبوونی لێبکەو، پەشیمان ببەرەوەو، بەڵێن بدە کە جارێکی دیکە نەگەڕێیتەوە سەر ئەو هەڵانە، خودا لە هەموویان خۆش دەبێت. بەزەیی و لێبووردەیی خوای پەروەردگار یەکجار زۆرە، بەشی هەموو کەسێك دەکات".

پوورە نەریمان بە هەموو هەست و سۆزێکییەوە ئەو باسەی دەگێڕایەوە کە ئەو دەنگە گریاناوی و گەرمەی هەموو دونیاو ژیری و هەستەکانمی ژیانەوە.

ئەو ڕووداوە زۆر سەرسوڕهێنەرو ئومێدبەخش بوو، پێشتر شتی لەو جۆرەم نەبیستبوو... کەواتە ڕێگا هەیە بۆ ڕزگاربوون لە خراپەکارییەکان.

تەوبە دەکەیت و بەڵێن دەدەیت بە خوای پەروەردگار کە جارێکی دیکە ئەو هەڵانەی ڕابردوو ئەنجام نەدەیتەوە، ئەوکات خوای گەورە لە هەموو تاوانەکانت خۆش دەبێت، ئایا بەو شێوەیەیە؟ ئەمە موژدەیەکی زۆر ناوازە بوو. یەکەمجاربوو تروسکایی ئومێد لەناخمدا دەربکەوێت.

پرسیم: "ئەو زاتە کێ بوو کە چووبووە خەونی دایکمەوە؟"

وتی:"زاتێك بوو بە ناوی (سەعیدی نوورسی)".

– ئەو سەعیدە بەڕێزە کێیە؟

– نازانم ڕۆڵەکەم. هەرچۆنێك بێت دەبێ کەسێکی پیرۆز بێت.

پووره نەریمان، بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوەی بەسەرهاتی دایکم:

– کچم دایکت زۆر گۆڕا، چۆن باسی لێوە بکەم. دابڕا و دەستی کرد بە ئەنجامدانی نوێژەکانی، دەستی کرد بە گێڕانەوەی نوێژو ڕۆژووەکانی. وەك ئەوەی بڵێی نەخۆشییەکەی کەمبوبێتەوە، ورەی زۆر بەرز بوو. بەتەواوی گەڕایەوە بۆ لای خوای پەروەردگار و خۆی بۆ مردن ئامادەکرد، بەڵام لەو ماوەیەدا بەردەوام بیری لای تۆیش بوو، تەنانەت یەك ساتیش ناوی تۆی لەسەر زار لانەدەچوو.

ئاه دایکە گیان، بەهۆی منەوە تووشی ئازارو ناڕەحەتی زۆر بوویت... تۆ پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکەیت گەڕاویتەوە بۆ لای خودا و خۆت بۆ مردن ئامادە کردووە!

گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا و خـۆ ئامـادەکردن بـۆ مـردن... شـادی بەخشیبووە دایکـم، وڕەی بـەرز کردبـووەوە... دایکـم پـێش مردنـی تەوبـەی کردبـوو و خـۆی بـۆ مـردن ئامـادەکردبوو بـۆ ئـەوەی بـە ئیمانەوە بگەڕێتەوە بۆلای خوا...کەچی من دەمەوێت بە خۆکوشـتن و یاخی بوون کۆتایی بە ژیانم بهێنم. کەواتە هەموو مردنێك وەك یەك نییە.

پوورە نەریمان بەردەوام بوو لەسەر باس کردنی کۆتـا سـاتەکانی ژیانی دایکم:

– هاتمە خوارەوە بۆئەوەی چاودێری خوالێخۆشبوو بکەم، خوایە گیان، ئەو ڕۆژە کەسێکی تربوو. وەك ئەوەی لە هەموو ئێش و ئـازار و دڵتەنگییـەك ڕزگـاری بووبێـت، هـەموو ئیشـەکانی دونیـای تـەواو کردبوو، خۆی ئامـادەکردبوو وەکـو ڕێبـوارێ خواحـافیزی لـە ژیـانی دونیا بکات. ڕووخساری یەکپارچە دەدرەوشایەوە.

وتم:"حاڵت چۆنە یاسەمین خان؟"

وتـی: "هـەزارەها سـوپاس بـۆ خـوا، ئـەمڕۆ بـە ئـارامی نوسـتم. تاوەکو نوێژی بەیانی لە خـوای پـەروەردگار پاڕامـەوە. بـۆ کچـەکەم پاڕامەوە. ئیشەڵا خوای گەورە ئەویش چاك دەکات".

نەمتوانی خۆم ڕابگرم. خۆم هاویشتە ئامێزی پوورە نەریمانەوە. یەکەم جاربوو لە هەستێکی وەها شیریندا بژیم و بە گریان دڵشـاد ببم.

– واتە دایکی خوالێخۆشبووم لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا لە خوای گەورە پاڕاوەتەوە بۆئەوەی چاك ببم ها !

– پوورە نەریمان، ئەمە گیرا دەبێت؟ واتە ڕابردووی خۆم واز لێبێنم.

وتی: "خەفەت مەخۆ فاتۆش گیان، ئیشەڵا خوای گەورە نزای دایکت ناگێڕێتەوە".

منی لە ئامێز گرتو فرمێسکەکانی سڕیمو بەسۆزو میهرەبانییەوە دەستی هێنا بەسەرمدا.

وتی: "کچم موژدە ڕاستەقینەکەم نەوتووە".

دەستی کرد بە باسکردنی ئەو ڕووداوەی کە منی سەرەوژێر کردو بوو بە گرنگترین وانەی ژیانم.

– دایکی خوالێخۆشبووت لە پڕ تەندروستی تێکچوو. لە جێگادا کەوت. زۆر هەوڵمدا ببەم بۆ لای پزیشك، بەڵام نەیهێشت، چونکە تێگەیشتبوو لەوەی کە ئیتر دونیا بەجێدەهێڵێت. چاوی بڕیبوویە دەرگاکە. وتی: "پوورە نەریمان، ئەوەتا هاتن " هەوڵیدا هەستێتەوە. زۆر دڵخۆش بوو. ئاوڕم بۆ لای دەرگاکە دایەوە و وتم: "کێ هات یاسەمین ؟" وتی: "دەبینیت پوورە نەریمان. ئەوان هاتوون من دەبەن". من پێداگریم کرد وتم: "ئەوانە کێن؟" "ئەو فریشتانەن کە هاوڕێم دەبن لە گۆڕدا. چەندە جوان و نوورانین".

ڕووی کردە من وتی:" فاتۆش گیانم دەسپێرم بە تۆ. گەردنیم ئازاد کردووە. داواکارم لەخوای گەورە ڕزگاری ببێت لەو ڕێگا چەوتە و ببێتە قسمەتی موسوڵمانێك کە بە شیری حەڵاڵ گەورە بووبێت. تەنها ئەمە ئازارم دەدات. خوالێخۆشبوو بە خوێندنی شەهادەت گیانی سپارد، فڕی بۆ بەهەشت، ڕۆیشت... "

مامۆستا گیان، نەمتوانی بەرگەی ئەم ئازارە بگرم، هێشتا لە ئامێزی پوورە نەریماندا بووم دەستمکرد بە گریان.

ئاخ دایکی خوالێخۆشبووم، دایکە گیان! تەنانەت لە کۆتا هەناسەیدا ئەم کچە یاخی بوو و، پیس و تاوانبارەی لە بیرنەچووە. تەنها کێشەی من بووە... گەردنیشی ئازاد کردووم. ئاخ دایکی میهرەبان و بەسۆزم، دایکە گیان...

لەگەڵ پوورە نەریماندا بە دوور و درێژی قسەمان کرد. دونیای ئەو تەواو لە دونیای من جیاوازبوو، بۆنی شادی و مرۆڤایەتی لێدەهات. ژیانی منیش بەقسە ئازادیخوازانەو سەردەمی بوو، بەڵام لەڕاستیدا بۆنی خراپەکاریو ترس و پیسی لێدەهات.

لەژیانمدا هەڵەی زۆرم کردبوو، پاکبوونەوە لێیان زۆر قورس بوو. ئایا دەکرا نکۆڵی لە هەڵەکانم بکەم؟ ئایا دەمتوانی وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت تێکەڵ بە کەسانی پاكو، سەر ڕاست و نیاز باش ببم؟ یاخود بەو بارودۆخەوە دەمتوانی داوا لە خوای گەورە بکەم بۆئەوەی لێم خۆش ببێت.

بەڵام دایکی خوا لێخۆشبووم ئەمەی دەویست، هاتم بۆ ئەم شوێنە بۆئەوەی پێش خۆکوشتن بۆ کۆتا جار سەردانی یادەوەرییەکانی دایکم بکەم، نەمدەزانی ڕووبەڕووی ڕووداوێکی لەو جۆرە کتوپڕ دەبمەوە. لەوانەیە هێزێك هەبێت کە ڕاست بۆ شوێنێك ڕاماندەکێشێت.

پەرداخە چایەکەی بەردەمم بەتاڵ بووبووەوە. چایەکەم خواردبووەوە، بەڵام بیرم نەدەکەوتەوە چۆن خواردوومەتەوە.

نزیکەی دوو سێ کاتژمێر لەلای پوورە نەریمان مامەوە. ئیتر داوای ڕووخسەتم کرد بۆ ئەوەی بڕۆم، ئەوەندەی پێ نەچوو ئێسرا نووری هاوڕێم هات.

پێم دەوت هاوڕێکەم، بەدڵنیاییەوە هاوڕێی قۆناغی ئامادەییم بوو. نەك وەکو هاوڕێیانی گروپەکەم، یان وەك من...

لەگەڵ ئێسرا نووردا بەیەکەوە قۆناغی ئامادەییمان خوێند. ئێسرا نوور نەوەی پوورە نەریمان بوو. یەکەم کچی کوڕەکەی بوو. دایکی ئێسرا نووریش دوو ساڵ پێش ئێستا لە ڕووداوێکی هاتووچۆدا گیانی لەدەست دابوو.

لەمماڵەدا خۆیی و پوورە نەریمان و باوکی بەیەکەوە دەژیان. ئەو ژێر زەمینە یەك ژوورییەی ماڵی ئێمەش هی ئەمان بوو، بەڵام پوورە نەریمان سەلامەت بێت، لەگەڵ ئەوەی بۆ ماوەی ٢ ساڵ پارەی لە دایکم وەرنەگرتبوو بە هەموو جۆرێك یارمەتیشی پێشکەش کردبوو.

نزیکەی ساڵێکە نەمتوانیوە چاوم بە ئێسرا نوور بکەوێت، ئەو کاتە کچێکی گەنجی ئارامو کراوە بوو و، بیری چەپی هەبوو.

یەکترمان لە ئامێز گرت، ماوەیەك غەریبیمان بەلاوە نا.

پێش چوار مانگ مامۆستایەکی پێشووی ئێسرا نوور کتێبەکانی تۆی (ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگەڕێت، محمەدی دوزجەیی و خۆمم دۆزییەوە) دابوو بە ئێسرا نوور، کتێبەکانت زۆر کاریگەرییان لەسەر ئێسرا نوور دروست کردبوو، باڵاپۆشی پۆشیبوو دەستی کردبوو بە نوێژەکانی، تەنانەت باوکیشی کتێبەکانتانی خوێندبوەوە، ئەویش گەڕابۆوە و وازی لە مەی خواردنەوە هێنابوو، دەستی کردبوو بە ئەنجامدانی پەرستشەکان.

ئێسرا نوور و باوکی هەندێ ڕۆژ بەشدارییان لە وانە دینییەکاندا دەکرد.

ئێسرا نوور ئەوەندە باسی کتێبەکانی کرد، کە تامەزرۆی بووم. لە جانتاکەیی دەرهێنا و دای بە منیش. هەروا تەماشایەکی ڕاست و چەپی کتێبەکەم کرد.

ڕاستییەکەی پوورە نەریمانیش بەنیاز نەبوو ئەو ڕۆژە ڕێگەم بدات بڕۆم، لەوێ بوومە میوانی ئێسرا نوور.

ئینجا مامۆستا گیان، ئەو شەوە بوو بەخاڵی وەرچەرخان لە ژیانمدا.

هەر ئەو شەوە کتێبی (ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگرێت)م خوێندەوە و تەواوم کرد. بە مانای وشە کتێبێکی ناوازەیە. ئەی (محەمەدی دوزجەیی)! نەمدەتوانی پێشبینی ئەوە بکەم کە کتێبێك ئەوەندە کاریگەری هەبێت لەسەر مرۆڤ و ژیانی بگۆڕێت.

پاش ئەمە ڕووداوەکان بە شێوەیەکی جوان بەرەوپێشچوون... خوای پەروەردگار دەرگاکانی ڕەحمەتی بەجۆرێك بەڕوومدا کردەوە کە.. پاڕانەوەکانی دایکی خوالێخۆشبووم بە جۆرێك گیرا بوون کە..

لە سایەی کتێبەکانتەوە سەرلەنوێ خۆمم دۆزییەوەو گەڕامەوە بۆ ژیان. سوپاس بۆ خوای گەورە کە لەو خراپەکاری و تاوانانە ڕزگارم بوو.

لەڕێگەی خوێندنەوەی کتێبەکانتەوە پەیامەکانی نوورم ناسی. سوودێکی زۆرم لێوەرگرتن. پەیامەکان بوونە تیشك و ئومێدی ژیانم.

پێشبینی ئەوەش دەکەم کە ئەو زاتەی بەناوی سەعیدی نوورسییەوە دایکی خوالێخۆشبووم لە خەونەکەیدا بینیبووی، حەزرەتی سەعیدی نوورسی نووسەری پەیامەکانی نوورە. ئێوە ڕاتان چۆنە؟

ئێستا بووکی پووره نەریمانم، ئەو کەسەی هەوڵی زۆریدا بۆ ئەوەی پەیوەست بم بە ژیانەوەو ڕاستییەکان بدۆزمەوە. واتە بووم بە دایکی ئێسرا نووری هاوڕێم. هەرچەندە باوکی تەمەنی زۆر لە من گەورەتر بوو، بەڵام بەلامەوە گرنگ نییە، چونکە ئەو مرۆڤە دۆستانە منیان پەسەند کرد و، پێیان لە جەرگی خۆیان نا. ئیدی من بڕیارم

دابوو بەئاسوودەیی بژیم و، نەگەڕێمەوە بۆ ئەو جێگا پیس و خراپانە.

دوو ساڵ دەبێت هاوسەرگیریم کردووە. کچێکمان هەیە جوانی دونیاکان. تەمەنی یەك ساڵە. ناوی یاسەمینە. بەناوی دایکی خوالێخۆشبوومەوە ناوم ناوە. خوای پەروەردگار قەدەری ئەم باشتر بکات.

زۆر شادمانو دڵخۆشم. مێردێکی زۆر تێگەیشتووم هەیە. دەمانەوێت لەگەڵ تۆدا یەکتر بناسین و بانگهێشتت بکەین بۆ ماڵەوە... زۆر خۆشحاڵ دەبین شەرەف مەندمان بکەیت. ئێستا تەنها داخوازیم ئەوەیە کە هەواڵێکم لە باوکم هەبێت، بە مردوویی یان بەزیندوویی...

لەوانەیە زۆر درێژەم بە قسەکانم دابێت لەم نامەیەدا، بەڵام هێشتا یەك لەسەر دەی بەسەرهاتی ژیانم نووسیوە.

یەك بەیەکی ئەم دێڕانەم بەجۆش و خرۆشەوە نووسیوەو بە فرمێسك ئاومداون، بەبێ ئەوەی هیچ وشەیەکی بۆ زیاد بکەم، تەنانەت لەوانەیە وەکو پێویست نەمنووسیبێت.

مامۆستا گیان، بەڕاستی تۆ نازانیت چەندە سوپاست دەکەم، چەندە دۆعات بۆ دەکەم. ژیانی منت ڕزگار کرد. خوای گەورە تەندروست و شادمانت بکات و خامەت بە بڕشت بکات.

دەستەکانت ماچ دەکەم.

**فاتمە نوور**

# مامۆستا ڕەمەزان



لەم نووسراوەدا بڕگەیەکی دوور و درێژی ژیانی خوێندکاریی ڕەمەزان دەمیرتان پێشکەش دەکەم، کە ژیان و مردنی پڕن لە پەندو وانە. لەو باوەڕەدام کە سوودی زۆر لە خوێندنەوەی یاداشتەکانی وەردەگرن. یادەوەرییەکانی مامۆستا ڕەمەزان بەم شێوەیە دەستپێدەکات:

لە خێزانێکی کەم دەرامەتدا هاتوومەتە دونیاوە. ماوەیەك بوو بیرم لە داهاتوو دەکردەوە. ئەوەندەی نەخایاند هەواڵم پێگەیشت کە لە قوتابخانەی سەرەتایی وەرگیراوم. لەخۆشیدا وامدەزانی هەموو دونیا هی منە.

قوتابخانەکە لە هەرێمەکەمانەوە زۆر دوور بوو. دەمزانی بە چوونم بۆ ئەوێ زۆر بیری دایك و باوك و خوشك و براکانم دەکەم، بەڵام لەپێناو خوێندندا ئامادە بووم بەرگەی هەموو ئەو نارەحەتیانە بکرم.

قوتابخانەکە شەوانە بوو. دەموت لەوێ سکم تێر دەبێتو جل و بەرگی نوێم دەبێت. دەوڵەت هەموو پێداویستییەکمان بۆ دابین دەکات. بە تەواوکردنی خوێندنیش دەبمە مامۆستا. ئەمانە بۆ منداڵی خێزانێکی هەژاری وەك من زۆر گرنگ بوون، چونکە لەماڵی خۆمان نەمدەتوانی تەنانەت خەیاڵیشیان پێوە بکەم.

بۆ یەکەم جار لە خێزانەکەم مامۆستایەك هەڵدەکەوت. دەبووم بە تیشکی ئومێدێك بۆ خێزانەکەم کە لە ناو نەبوونیەکی گەورەدابوون. لە ئەنجامدا دەبووم بە کەسێکی خاوەن موچەو، جوان پۆش، خاوەنی خەیاڵی داهاتوو، کەسێك کە بە هەموو جۆرێك دەمتوانی یارمەتی خێزانەکەم بدەم.

دایكو باوكو خوشك و برا و خزمەکانم بە فرمێسك ڕشتن منیان بەرەو قوتابخانەکەم بەڕێ کرد. بۆئەوەی بەخێومان بکەن و گەورەمان بکەن، دایکم و باوکم دەیان وت: "کوڕم خەفەت بۆ ئێمە مەخۆ، تۆ گرنگی بە خۆت و خوێندنەکەت بدە. ئاگاداربە ئەگەر پارەت پێ نەما، هەواڵمان بۆ بنێرە ئێمە پارەت بۆ دەنێرین".

ئاه دایکە گیان، بازنەکەی دەستی کە زۆر گران بەهاش نەبوو فرۆشت و، پارەی خەرجی پێدام، لە کاتێکدا خۆی نەخۆش بوو پێویستی بە چارەسەر هەبوو.

برا بچوکەکەم پارەی شوانییەکەی لەدەستدا بوو بێ ئەوەی من ئاگام لێی بێت خستبوویە گیرفانمەوە. ئەو لە ژێر گەرمای

سوتێنەردا نانی وشکی دەخوارد و، منیش لە قوتابخانە بیرم لە داهاتووی خۆم و خوشك و براکانم دەکردەوە.

باوکم چاکەت و پانتۆڵێك و جوتێك پێڵاوی بۆ کڕی بووم. ئەوە یەکەم جلم بوو کە لە ژیانمدا بەتازەیی لەبەرم کرد. لە کوێوە بزانم کە باوکی زەحمەتکێشم بۆ پارەی ئەو جلانە بە درێژایی بیست ڕۆژ بە تەور دار ورد دەکات بۆ ئەو پیاوەی کە جلەکانی لێ کڕیوە. باوکم بەو لاوازی و ماندوێتییەوە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە کوڕەکەی موحتاج نەبێت.

چووم بۆ قوتابخانەو لەوێ نیشتەجێبووم. دونیایەکی زۆر جیاوازبوو بۆ منداڵێکی بچوکی گوندنشین، شوێنێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو.

هەموو شتێك لەبەرچاوم نامۆو گەورە دەردەکەوت، هەر لەو قاپانەی کە نانمان تیادا دەخواردن، تا دەگاتە چەتاڵ و، کەوچك و، نوێن و دۆلابەکان، تەنانەت ئەو قەنەفانەی کە لەسەریان دادەنیشتین.

هەوڵم دەدا بەم ژیانە نوێیە ڕابێم و لەو حەپەسانە بەئاگابێم، چونکە من تەنها ئامانجێکم هەبوو ئەویش ئەوەبوو کە ساتێك زووتر قوتابخانە تەواو بکەم و، کۆتایی بە بێ چارەیی و هەژاریی خۆم و خێزانەکەم بهێنم.

بەلای منەوە بە بوونە مامۆستا هەموو شتێك تەواو دەبوو.

دەستمانکرد بە ناسینی یەك بە یەکی ئەو مامۆستایانەی کە وانەیان پێدەوتینەوە. ئەو ڕووداوانەشی منیان دەترسان و لێیان دەسڵەمیمەوە لەوکاتەوە دەرکەوتن.

بەشێکی زۆری مامۆستاکانمان بێ بڕوا بوون. لە هەموو وانەکانیاندا دژی خوداو دین و قورئان قسەیان دەکرد و، بیری ئێمەیان تێکدەدا.

لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا کەوتبووینە ناو بارودۆخێکی مەترسیدارەوە، بۆ تەواوکردنی قوتابخانە پێویست بوو بەو جۆرە بیربکەینەوە کە مامۆستاکان دەیانویست، ئەگینا ژیانی قوتابخانە دەکەوتە بەر هەڕەشەو، خەیاڵی مامۆستایەتیش بەفیڕۆ دەچوو.

لەسەرەتادا زۆربەی ئەو قوتابیانەی دەهاتن بۆ قوتابخانە دیندارو پاك و بێگەرد بوون، هەوڵیان دەدا بەرپەرچی ئەو بیروبۆچوونە هەڵانەی ناو ناوەندی خوێندن بدەنەوە.

ئەو قوتابیانەی کە بەرهەڵستی گفتوگۆی مامۆستاکانیان دەکرد، یان کاریگەریان دەخستە سەر بیری مامۆستاکان، یان لە ترسا و لە خەمی داهاتوویاندا دەستیان دەکرد بە گۆڕان.

لەو ماوەیەدا سالێك تێنەدەپەڕی ئەو قوتابییە پاك و خاوێن و باوەڕدارانەی کە دەهاتن بیرکردنەوەیان دەگۆڕا، وەك کەسێکی دژ بە دین و ئیمان دەگەڕانەوە ناو خێزانەکانیان.

نەمتوانی ئەم بارودۆخە بۆ خێزانەکەم باس بکەم. ئینجا وەك جاران نەمدەتوانی بەخۆشحاڵییەوە نوێژ بکەمو، بچم بۆ مزگەوت و بە گەرموگوڕی بەهاکانی باوەڕ لە ناخمدا بپارێزم.

ساڵی دووەم ئاستەنگەکان هێندەی تر زیادیان کرد. ئەو هاوڕێیانەی کە دژی گفتوگۆی مامۆستاکان دەوەستانەوە، یان نەیان دەتوانی پۆلەکان تێبپەڕێنن، یان بە گروپێکەوە تێوەدەگلان و لە قوتابخانە دووردەخرانەوە. ئێمەش بەهۆی ئەو بارودۆخەوە خەفەتمان دەخوارد.

هەموو ڕۆژێك لە قوتابخانە پشکنین دەکرا. ئەگەر کتێب یان بڵاوکراوەیەکی ئایینیان بدۆزیایەتەوە، ئەنجامەکەی زۆر مەترسیدار دەبوو.

زۆرێك لە مامۆستاکان بەئاشکراو ڕاستەوخۆ بەردەوامییان بە پروپاگەندەکانیان دەدا.

باسی ئەوەیان دەکرد کە سەربەستی لە کۆمۆنیزمەوە سەرچاوەی گرتووە. (حاشا ) خودا بوونی نییە، دین و قورئان بیری ناماقوڵین، پێغەمبەر مرۆڤەکانی فریوداوە، ئەوەی پێی دەوترێت ڕۆژی دوایی شتێك نییە بوونی هەبێت، بابەتەکانی وەك فریشتە، بەهەشت، جەهەنەم، لێپرسینەوە هەموو درۆن، هەموو شتێك لە دونیادا بریتییە لە کەیف و خۆشیو ڕابواردن.

ئەگەر قوتابیەکان بەرهەڵستی ئەمانەیان بکردایە، بەخراپی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکراو سزا دەدران.

منیش کە مامۆستاکان بەو شێوەیە باسیان لە دید و بۆچوونەکانیان دەکرد کەوتبوومە ژێر کاریگەرییانەوە، یاخود بەلایەنی کەمەوە لەبەر داهاتووی خۆم وا خۆم دەردەخست کە کاری تێکردووم.

بەڕاست سەربەستی لە کۆمۆنیزمەوەیە؟

خوای گەورە (حاشا) بوونی نییە؟ هەموو بەدیهێنراوان بەبێ مەبەست و ئامانج دروست کراون؟ ئایا پاش مردن دووبارە زیندوبوونەوە و لێپرسینەوەك نییە؟ ئایا ئەو فریشتانەی کە چاودێریمان دەکەن چاکە و تاوانەکانمان دەنووسن بوونیان نییە؟ ئایا دین‌و، ئیمان‌و، قورئان و پێغەمبەر، بوونیان نییە؟

مامۆستاکان بەردەوام ئێمەیان لەمەڕ ئەم بابەتانەوە دەخستە دوودڵی و نکوڵی کردنەوە.

ئەم جۆرە هەوڵانە مێشکمیان تێکدابوو، بەتەواوی شپرزەیان کردبووم.

بەخۆمم دەوت: "شتی وا نابێت"، ئەم گەردوونە بەدیهێنەرێکی هەیە. مەگەر ئەوانەی تا ئەمڕۆ باوەڕیان بەخوداو، پێغەمبەرو، دین و قورئان هەیە هەمیشە هەڵە بیریان کردووەتەوە، ئایا تەنها

مامۆستاکانی ئێمە دروست بیردەکەنەوە، لە ناخی خۆمدا لەگەڵ خۆمدا شەڕم دەکرد.

لەناخەوە هەستم بەوە دەکرد کە ڕۆژێك دێت ئەم بێباوەڕی و نکوڵی کردنە هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام بۆ وەڵامدانەوەیان پێویستم بە سەرچاوەیەك هەبوو.

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بێزارتر دەبووم، لەدڵی خۆمدا دەموت خۆ من وەك مامۆستاکانمان بێ شەرمی بەرامبەر بە بەهاکانی باوەڕ نانوێنم و خۆم بەبێ باوەڕ نازانم، بەڵام چۆن ئەمانە بۆ خودی خۆم بسەلمێنم و باوەڕی پێ بهێنم؟

تا دەهات پرسیارەکان لە مێشکمدا زیاتر دەبوون.

پاش مردن مرۆڤ دەبێتە خۆڵ، هەموو ئەندامو ئێسکەکانی دەڕزێنو بڵاو دەبنەوە، لەوانەشە بسوتێنرێن و ببنە خۆڵەمێش. ئایا دەکرێت مرۆڤ دوای ئەوەی بوو بە خۆڵەمێش زیندوو بکرێتەوە؟ کە مرۆڤ زیندوو نەکرێتەوە، ئایا ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوە دەبێت؟

"ئەو بەدیهێنراوانەشی کە نابینرێن وەك فریشتە، جنۆکە، شەیتان پەیوەندییان بە ڕاستییەوە نییە". ئەگەر فریشتەکان و شەیتان هەبوونایە ئەوا دەمانبینین.

"مرۆڤەکان لە پێغەمبەر ئادەم نین، لە مەیمونەوە هاتوون. ئەگەر بەو شێوەیە بێت بەدیهێنان ئامانجێکی نییە".

ئەمانەم بە تەواوی پەسەند نەدەکرد، بەڵام دەیسەلمێنم و ناتوانم خۆیشم قایل بکەم، بە تێپەڕبوونی ڕۆژ لە دین و ئیمان سارد دەبوومەوەو، لە پەرستشەکان دووردەکەوتمەوە.

دیسان ئەو شەوە زۆر شپرزە بووم لە ناخی خۆمدا زۆر لە خوای پەروەردگار پاڕامەوە.

وتم: "خوایە گیان، یارمەتیم بدە، ڕێگایەکم نیشان بدە. باوەڕ بەمانە ناکەم، بەڵام هەنگاو بە هەنگاو لە بێ باوەڕی نزیك دەبمەوە. ئەگەر ڕاستییەك لەسەر دەستم ڕوونەدات، ڕێگایەك نابێت بەرەو ڕاستیم ببات، کۆتایی ئەم کارەش زۆر ترسناکە".

پاڕامەوە، گریام، داوای یارمەتی و ڕزگاریم کرد.

بەو شێوەیە خەوتم.

ئەوەبوو لەو شەوەدا خەونێکی سەیرم بینی.

لە خەونمدا بوومەلەرزەیەکی ترسناك ڕووی دا. زەوی شەقی بردو، ماڵەکان ڕووخان، هەموو لایەك لەناو ئاو و قوڕدا نوقم بووبوون خەریکبوو دەخنکان، بۆئەوەی بێنەدەرەوە پەلەقاژەیان دەکرد و، بە شوێن ڕزگارکەرێکدا دەگەڕان.

منیش لەناو ئەو خەڵکەدا بووم کە پەلەقاژەیان دەکرد و داوای یارمەتیان دەکرد بۆئەوەی نەخنکێن.

بەبێ وەستان هاوارم دەکرد و دەموت: "فریام بکەون، ڕزگارم بکەن، خەریکە دەخنکێم!".

تەماشام کرد کەسێکی تەمەن مامناوەندی نوورانی و ڕووگەش لە حەوشەی مزگەوتێکدا بە پێوە بوو، ڕاست دەستی بۆ شۆڕکردمەوە، لە لایەکیش ئیشارەتی دەکرد و دەیوت:"وەرە ئەم لاوە". دەستم کرد بە ڕۆیشتن بەرەو ئەو پیاوەی کە لە قوڕەکەدا خەریك بوو دەخنکا. بەڵام کەوتمە شوێنێکی وەها کە توانام نەما بڕۆم، تێگەیشتم لەوەی کە ئیتر دەمرم.

ئاوڕم دایەوە بۆ کەسە نوورانیەکە و هاوارم کردو وتم:"ڕزگارم بکە!". لەهەمان کاتدا دەموت: "خوایە گیان، یارمەتیم بدە"داوای یارمەتیم دەکرد.

زۆر نزیك بووبوومەوە لە حەوشەی مزگەوتەکە. سەیرم کرد ئەو زاتە یەك یەك و دوو دوو دەستی خەڵکەکە دەگرێت و دەریان دەهێنێت و دەیانخاتە حەوشەکەوە.

بە زەردەخەنەوە بە منی وت:

"مەترسە براکەم، تۆش ڕزگار دەکەم"و ڕاست گوریسێکی بۆ هەڵدام. تەواو کۆتایی گوریسەکەم گرت. منیشی ڕاکێشا و خستمیە ناو حەوشەی مزگەوتەکەوە.

وتی:"دەی چاوت ڕوون، ڕزگارت بوو".

هەڵسوکەوتی هێندە دڵسۆزانە بوو کە تەواو ترسی ناو ناخمی ڕەواندەوە.

وتم:"خودا لێت ڕازی بێت ئەگەر تۆ نەبوویتایە دەمردم".

وتـی:"نـەخێر براکـەم، لـە دایکبـوونو مـردنیش فـەرمانی خـوای پەروەردگارن، تۆ سوپاسی من مەکە، سوپاسی خودا بکە ...".

وتم:"هەندێ کەس دەڵێن، (حاشا) خودا بوونی نییە".

وتـی: "دوایـی وەڵامـی ئـەو پرسـیارەت دەدەمـەوە. سـەیرکە دەبینیت کە ئێستا کارم هەیە"، بەردەوام بوو لەسـەر ڕزگـارکردنی ئەو کەسانەی کە خەریك بوو دەخنکان.

بەڵام لە ناخمدا جۆش و خرۆشێکی سەیر دروست بوو.

وتم:"سوپاس بۆ خوا، کەسێکم دۆزییەوە کە وەڵامی پرسیارەکانم دەداتەوە. واز لەم پیاوە ناهێنم".

بەم جۆرە بە خەبەرهاتم.

خەونێکی سەرسوڕهێنەر بوو.

زەردەخەنەو دیمەن و ڕەفتاری ئەو زاتەم بەڕوونی لەبەرچاوە.

ئاه چی دەبوو ئەگەر ڕاست بووایە.

لەڕاستیدا ئەو بوومەلەرزەیەی خەونەکە تـەواو باسـی لـە دونیـای ناخی من دەکرد.

خەریك بوو لە ناو قوڕ و چڵکاوی بێ باوەڕیدا دەخنکام.

پێویستم بە هێزێك، بیرێك، سەرچاوەیەك هەبوو کە ڕزگارم بکات. لەوانەشە کەسێکی لـەو شـێوەیە یارمـەتی مـن بـدات. لـە جێگاکـەم هەستام.

وتم:"خوایە گیان، هۆکار و بەزەییت بنێرە بۆ یارمەتیدانم. زۆر ئاتاجم. نامەوێت بێ دین و ئیمان بژیم. لە چڵکاوی خنکێنەری بێ باوەڕی ڕزگارم بکە".

ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەینی بوو. زۆر دەمێك بوو نوێژم نەکردبوو. چی دەبێت با ببێت، بڕیارم دا بچم بۆ نوێژی هەینی. دەمزانی کە ئەمە کارێکی ترسناکە ئەگەر مامۆستاکانم ببیستن کەوا من چووم بۆ نوێژی هەینی، لەوانەیە قوتابخانەش بکەوێتە مەترسییەوە.

بەڵام پێویست بوو بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە خۆم بخەمە نێو مەترسییەوە. لە نزیك قوتابخانەکەماندا مزگەوتێك هەبوو. بێ ئەوەی کەس بمبینێ بەزوویی چووم، خۆم خزانە گۆشەیەکی مزگەوتەکەوە.

دەستم کرد بە گوێگرتن لە وتاری ئیمامە بەتەمەنەکە، تەنانەت نەمهێشت وشەیەکیم لەدەست بچێت، بەڵام ئەو بابەتەی باسی دەکرد ئەو بابەتانە نەبوو کە من دەمویست، قەیناکە هەرچۆنێك بێت سوودی هەبوو.

پاش نوێژەکە چاوەڕێم کرد تا هەمووان بچنە دەرەوە، بۆ ئەوەی کەس نەمبینێت و هەندێ پرسیاریش لە ئیمامە بەڕێزەکە بکەم. لە کەسێکی بەتەمەن و دونیا دیدە دەچوو، بەهیوا بووم کە وەڵامی پرسیارەکانم بداتەوەو لە قەیرانی بێ توانایی ڕزگارم بێت.

لـە دوای نوێـژ خەڵکەکـە چۆڵیان کـرد. ئیمـام چـووە حەوشـەی مزگەوتەکەوە. چەند کەسێکی لەلا بوو. خۆم کۆکردەوە و لـە ئیمـام نزیك بوومەوە.

وتم: "مامۆستا گیان، ئەگەر مۆڵەتم بدەیت دەتوانم کەمێك قسەت لەگەڵ بکەم؟".

ئـاوڕی لێ دامـەوەو، بـە وردی سـەرنجیدام وەك ئـەوەی بلێـی بـە شـوێن کەسـێکی گومـانلێکراودا بگـەڕێت، پـاش ئـەوەی بـە باشـی وردبووەوە، کەمێك بـە دەنگێکـی ڕەق وتـی: "چ قسـەیەك دەکـەیت لەگەڵمدا" .

کەمێك لەو دەنگە ڕەقەی ترسام، بەڵام خێرا خۆمم کۆکردەوە.

وتم: "هەندێ پرسیارم هەیە".

بە هەمان ڕەقی وەڵامی دایەوە:

"پرسیاری وەك چی؟"

وتم: "هـین". چـۆن دەسـت پێبکـەم نـەمتوانی قسـەکە بـبڕم. "مامۆستاکانمان سەبارەت بە ئیمان نکوڵی لە هەندێ بابەت دەکەن، ئەوانەم دەپرسی".

"بابزانم تۆ لە کوێ دەخوێنیت؟".

"لە قوتابخانەی سەرەتایی".

زۆر بە ڕەقی و تورەیی لە چاوەکانمی دەڕوانی.

وتی: "سەیری من بکە ڕۆڵە، هاوڕێکانیشت هاتنە لام. پرسیاری ناماقوڵیان کرد. تۆبە خوایە گیان تۆبە... خودا، ڕۆژی دوایی، فریشتە هیچ بوونیان نییە... ئێوە هەمووتان بوونەتە بێ دین. دووربکەوەرەوە لێم. ئێستا هەموو گیانت دەشکێنم بێ ئیمانی نەگبەت...

قۆڵمی گرت و ڕاست پاڵیپێوەنام بۆ گۆشەکە. خۆیشی گەڕایەوە و ڕۆیشت.

بۆچی نەمتوانی سوود لە سەردانەکەم ببینم، ئەم ڕووداوە لەناخەوە منی هەژاند.

واتە وەك من هاوڕێکانیشم هاتوون و، داوای یارمەتیان لە مامۆستاکە کردووە. بە پرسیارەکانی ئەوانیش تووڕە بووەو، هەمان کاردانەوە بەرامبەر بە منیش نیشان دەدات .

باشە پێویستی دەکرد ئیمامێك ئەم کاردانەوەیە بنوێنێت؟ نەیدەتوانی بە تێگەیشتووییەوە ڕووبەڕووم ببوایەتەوەو گوێی لە قسەکانم بگرتایەو، ببوایە بە یارمەتیدەرم؟ باشە ئەگەر ئەم پرسیارانەمان لە ئیمامەکان نەکردایە، لە کێمان بکردایە؟

یاخود ئەم پرسیارانە وەڵامیان نەبوو؟ مامۆستاکانمان ڕاست بوون؟

خوا بمانپارێزێت تەنانەت نەمدەویست کارەکە بەمجۆرە کۆتایی بێت.

تەواو حەپەسابووم، نەمدەزانی چی بکەم، بەپێوە وەستابووم چاوەڕێم دەکرد.

کەمێك لە بەردەم قەرەباڵغیەکەدا دەنگێک هات، وتی: "برا".

ئەم دەنگە دەنگێکی شیرین، گەرم و ناسراو بوو.

ڕاست بۆ ئەو لایە گەڕامەوە کە دەنگەکەی لێوە هات.

ئۆو خوایە گیان! شتی وا نابێت. ئەو پیاوە، ئەوە ئەو پیاوەیە کە لە خەونەکەمدا ئیشارەتی بۆ من دەکرد.

بەڵێ، ئەو پیاوە.

ئەو پیاوەی لە خەونەکەمدا لە خنکان ڕزگاری کردم و ڕایکێشامە حەوشەی مزگەوتەکەوە. کت و مت خۆیەتی.

باڵای، ڕووخسارە شیرین و نوورانییەکەی، هەڵسوکەوتی جوان و دڵسۆزییەکەی، هەموو شتێکی... بەڵێ، ئەو کەسەی کە ئیشارەتی بۆ من کرد ئەو پیاوە بوو.

نەمدەزانی چیم بەسەرهاتووە، تەواو شپرزە بووم، بەخۆمم دەوت تۆ بڵێی ئەمە خەیاڵ بێت؟

نەخێر.. ئەمە خەون و خەیاڵ نەبوو.

ئەو پیاوە ڕاست بۆ لای من هەنگاوی دەنا، منیش ڕاست بۆ لای ئەو..

بە دەست ئیشارەتی بۆ کردم و بەدەنگێکی لەسەرخۆ ناخمی شادمان کرد.

وتی: "برا، بەبێ ویست ئاگاداری ڕووداوی نێوانتـان بـووم لەگـەڵ ئیمامی بەڕێزدا، لە کەموکوڕی ئەو ببوورە. ئیمامی بەڕێز بە تەمەنە، باش لـە دونیـای گەنجـەکان تێناگـات دەمێکـیش نیـە هاوسـەرەکەی کۆچی دوایی کردووە، لەبەرئەوە کەمێك تووڕەو بێزارە".

ئەم دیدارە منی زۆر دڵشاد کرد، بە هەڵسوکەوت و دەربڕینـەکانی ئەو پیاوە تەواو سەرسام بووم.

کە زانی من کەمێك هاتومەتەوە سەرخۆ وتی:

– حەزدەکەم یەکتر بناسین.

خۆمان بەیەکتر ناساند...

ناوی دۆغان بینێر بوو. لەفەرمانگەی دابەشکردنی ئـاو فەرمانبـەر بوو، تازە دامەزرابوو.

کاك دۆغان، بەزمانێکی شیرین وتی:

– ماڵەکـەم لێـرەوە زۆر نزیکـە بـە هاوسـەرەکەمم وتـووە تـا مـن دێمەوە چا ئامادە بکات. ئێستا چایەکەش ئامادەیە. هـەم قسـەش دەکەینو، زیاتر لە نزیکەوە یەکتر دەناسـین. هـەم چا دەخۆینـەوە. کاتی چا خواردنەوەش ئەو پرسیارانە تاوتوێ دەکەین کە دەتویسـت لە ئیمامە بەڕێزەکەی بپرسیت.

وەك ئەوەی ناخم بخوێنێتـەوە دەیزانـی گرنگـی بـە چـی دەدەم، دەیویست دەست بخاتە سەر ئەو خاڵە.

وتــی: "دەزانیــت کاتێـك ئـەو پرسـیارانەیان لـە منـیش دەپرسـی مێشکم سەرەوژێر دەبوو. کەسـێکی گـەورەم هەنـدێ کتێبـی پێـدام. وەڵامی هەموو ئەو جۆرە پرسیارانەی تێدایـە. بەڕاسـتی زۆر سـوودم لێوەرگرتــوون، هــەم خــۆم دەیانخوێنمــەوە هــەم دەیانــدەم بــەو کەسانەی کـە پێویسـتیان پێیانـە. فـەرموو بـا بـڕۆین لـەو کتێبانـە دەبەخشم بە تۆش".

چـۆن دەمتــوانی بڵـێم نـەخێر. چـەندین مـانگ بـوو لـە خـودا دەپاڕامەوە تا وەڵامی ئەو پرسیارانەم دەست بکەوێت.

لەڕاستیدا کـاك دۆغـان وەك وتـی ماڵەکـەی زۆریـش نزیـك نـەبوو. چاییش ئامادە نەبوو، بەڵام ئەو کەسێکی تێگەیشتووبوو، شێوازێکی جوانی بەکارهێنا بۆئەوەی بمباتەوە بۆ ماڵ و بەباشی یەکتر بناسین. گرنگ نییە، دەرەنجام ئەم هەڵسوکەوتەیشی جوان بوو.

ماڵەکـەی سـادەو خـاوێن بـوو. لـە کتێبخانەکەیـدا (پەیامــەکانی نوور)ی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی هەبوو.

ئینجا لە ژێر ئـەو تابلۆیانـەی کـە بـە دیوارەکـەدا هەڵواسـرابوون، نووسراوی پڕ مانا هەبوو.

"کات نیشانی داوە کە بەهەشت هەرزان نییە، جەهەنەمیش زیادە نییە".

" هەرکەسـێك بەباشـی شـتەکان ببینێـت، هەڵسـوکەوت و بیروبۆچوونەکانیشی جوان دەبن، خۆ هەرکەسیش بیروبۆچـوونەکانی جوان بوون، ئەوا تام و لەزەتی (ژیان) دەچێژێت".

"ئیمان مرۆڤ دەکاتە مرۆڤ. ڕەنگە مرۆڤ بکاتە پادشا. بەڵام کـوفر مرۆڤ دەکاتە گیانلەبەرێکی لاواز".

"ئەگەر ئیمان نـەبێت یـاخود ئـەو ئیمانـە کاریگـەری نـەبێت دژی یاخی بوون، ئەوا ژیان بە چێژێکی کەم و خۆشیەکی کـەم ڕووکـەش دەبێت و، بە هـەزاران جـار زیـاتر لـەو چـێژ و خۆشـییە ناخۆشـی و، دڵتەنگیی دەبەخشێت..."

لەگەڵ کاك دۆغان بەرامبەر یەکتری دانیشتین.

پرسی: "برا گیان، برسـیت نییـە؟ نـان هەیـە. ئەگـەر دەخوازیـت یەکەمجار سکمان تێر دەکەین، پاشانیش چاییەکەمان دەخۆینەوە".

وتم: "نەخێر، من نانم خواردووە".

زۆر پێداگری کرد. پەسەندم نەکرد.

بـەردەوام چـاوم لەسـەر کتێبـەکان و ئـەو نووسـراوە جـوان و کاریگەرانە بوو کە لە ژێر تابلۆکاندا نووسرابوون.

کـە کـاك دۆغـان هەسـتی بەمـە کـرد، چـەند کتێبێکـی لەسـەر مێزەکەی بەردەمی دانا.

پرسی: "ئەم کتێبانەت خوێندوەتەوە؟".

وتم: "نەخێر نەمخوێندونەتەوە و یەکەمجارە دەیانبینم".

وتـی: "ئـەم کتێبانـە تەفسـیری قورئـانن، ئینجـا ئـەم تەفسـیرە تایبەتمەندیەکـــەی ئەوەیـــە کـــە تیایـــدا ڕاســـتییەکانی ئیمـــان بەگونجاوترین شێواز ڕوونکراونەتەوە، بەخوێندنەوەی ئـەم پەیامانـە پەڕاوی بوونەوەر دەخوێنیتەوە".

– ئـەو مرۆڤانـەی ئـەم سـەردەمە کـە مێشـك و دڵیـان سـەرقاڵ دەکەن بە بابەتەکانی نکۆڵییەوە، گونجاوترین و قایلکـارترین شـێواز بەدەســـتدەهێنێت و، دەســـەلمێنێت. ئەوانـــەی ئـــەم کتێبانـــە دەخوێننەوە، لە نکۆڵیکاری و گومانەکان ڕزگاریان دەبێت.

زۆر خۆشحاڵ بووم، چونکە منیش سەدان پرسیاری لەو جۆرە لـە مێشك و دڵمدا هـەبوون. ئومێـدەواربووم، وتم: ئیشـەڵلا وەڵامـەکانیان دەدۆزمەوە.

پێویست بوو هەر لەو کاتەدا پرسیارەکانم لـە کـاك دۆغـان بکـەم. جارێکی تر ئەو هەلەم دەستنەدەکەوتەوە.

– مامۆســتاکانمان ڕۆژانـە کۆمـەڵێك بابـەتی سـەیرمان بـۆ بـاس دەکەن کە مێشکمان تێکدەدات. نکۆڵی لـە زۆرێـك بابـەتی ئیمـانی و ئیسـلامی دەکـەن. دەڵـێن: بابەتـەکانی وەك خـوداو، ڕۆژی دوایـیو، لێپرســینەوە و قـــەدەر بوونیـــان نییـــە و باوەڕیـــان پـــێ مەکـــەن. ڕوونکردنەوەی ئەم پرسیارانە لەم کتێبانەدا هەیە؟

کاك دۆغان بە بێ فیزی و دڵنیاییەوە وتی:

- هەیە نیگەران مەبە. یەك یەك وەڵامی ئەمانە وەردەگریت. هەم تۆ لەو كێشانە ڕزگارت دەبێت، هەم هاوڕێكانت ڕزگار دەكەیت، چونكە ئەم بابەتانە تەنها هی من و تۆ نین. بەڵكو بۆ هەموو كەسێكە.

بە پەلە دەستم پێكردو وتم: "با لەم بابەتەوە دەست پێ بكەین".

- ئاخۆ ئەم بوونەوەرە بەدیهێنەرێكی هەیە؟ یاخود هەموو بوونەوەران لەخۆیانەوە بەبێ بەدیهێنەر هاتونەتە بوون؟

كاك دۆغان كتێبی گرت بە دەستییەوە، لاپەڕەیەكی كردەوەو وتی:

- با هەم بیخوێنینەوەو، قسەیشی لەبارەوە بكەین، باوەڕم وایە كە بەشێوەیەكی زۆر تەواو و بێ كەموكوڕی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە.

بەبێ ئارامییەكی زۆر و سەرنجێكی زۆرەوە دەستم كرد بە گوێ گرتن.

ئەویش دەستی كرد بە خوێندنەوەی (پەیامی سروشت)، كە بەبەڵگەو نموونەی ناوازە ئەو ڕاستییانە دەسەلمێنێت كە بوونەوەر لەخۆیەوە دروست نەبووەو، هۆكارەكانی سروشتیش لەخۆیانەوە بەدینەهێنراون و، ئەو بوونەوەرەشی كە بەو تەرازووە وردە بەدیهێنراوە ئەوە دەردەخات كە دەستكردی زاتێكی بەتواناو خاوەن

حیکمەتە کە ئەویش خوای گەورەیە. ئەم کتێبە کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەرم. زیاتر لە دوو کاتژمێر ئەم گفتوگۆیە بەردەوام بوو، بە لێکدانەوەی ئەم وتانە تەواو بوو.

"تۆ گومانت لەو ڕاستیەدا نییە کە: گوندی بێ کوێخا و.. دەرزیی بێ وەستا و خاوەن و.. پیتی بێ نووسەر نییە و نابێت. ئەی ئایا چۆن ئەوە بەخۆت ڕەوا دەبینیت کە پێت وابێت ئەم وڵاتە ڕێکوپێک و ڕەنگینە بێ پادشاو فەرمانڕەوابێت".[1]

چاییان هێنا، بەڵام هەموو ئەو ڕاستییانە لەمێشکمدا دەنگیان دەدایەوەو دەموت:"خۆزگە چاییان نەهێنایەو بەردەوام بووینایە".

وەك ئەوەی کاك دۆغان بیرکردنەوەکەمی خوێندبێتەوە. هەم دەستمان کرد بە چایی خواردنەوە، هەم لەشیکردنەوەی بەشێك لە سەلمێنراوە زانستییەکانی پەیوەست بە بابەتەکەوە بەردەوام بووین.

وتی:"مرۆڤ دەست ڕەنگینییەکی نایابی خوای پەروەردگارە. بە دەربڕینێکی تر مرۆڤ دونیایەکی سەرسوڕهێنەرە. هەموو خانەو ئەندامەکانی لاشەی لە چوارچێوەی سیستەمێکی وردو ڕێکخراودا کاردەکەن.

ئەگەر هێندە بچووك بووینایەوە کە بچین بەناو مولولەکانی خوێندا، ئەگەر بمانتوانییایە بە لاشەی مرۆڤدا بگەڕێین، ئەوا

---

١- کتێبی (وتەکان) بە زمانی کوردی/ نووسینی م. سەعیدی نورسی / لاپەڕە ٦٠.

ڕووبەڕووی دونیایەکی هێندە سەرسوڕهێنەر دەبووینەوە کە لە تاو حەپەسان نەماندەتوانی لە کاری زمانە بچوکیش تێبگەین.

لاشەی مرۆڤ وەکو کارگەیەکی گەورەی ڕێکوپێکە کە ئامێرەکانی بەردەوام لەتازەبوونەوەدان. خانەکانی لەش بەردەوام لەکارو کۆششدان. خاوەنی چەندین شێوازو تایبەتمەندی جیاوازن، بەڵام سەرەڕای ئەرکە جیاوازەکانیشیان لەگەڵ یەکتریدا لە هەماهەنگییەکی ناوازەدان. هەموو ئەمانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە هەموو خانەکانی لەش لەلایەن خواوەندی بەدەسەڵاتی ئەزەلییەوە دروستکراون و گوێڕایەڵن بۆ یاسانی خوا.

هەر خانەیەکی لەشی مرۆڤ ٢٣ جوت کرۆمۆسۆمی تێدایە جگە لە تۆو هێلکە، هەر کرۆمۆسۆمێك هەزاران بۆهێڵی تێدایە کە ڕۆڵی گرنگیان هەیە لە چۆنیەتی گەشەی تاك و پەرەسەندنی و ڕابوون بە فرمانەکانی خۆی. هەر کرۆمۆسۆمێك لەدوو شریتی پێچ خواردووی درێژ پێکهاتووە کە پێی دەوترێت ناوکە ترشی DNA .

هەر خانەیەك لە لەشی مرۆڤدا ٢٥٠٠٠ گەردی DNAی تێدایە، چالاکییەکانی ناو خانە ڕێك دەخەن، وەك گواستنەوەی تایبەتمەندییەکانی دایك و باوك بۆ منداڵەکەیان. بە یەکگرتنی خانەی هێلکەی دایك لەگەڵ خانەی سپێرمی باوك لەناو خانەی ئەو هێلکە پیتراوەی کە دروست دەبێت؛ ناوکە ترشی DNA دەگوازرێتەوە بۆ هەر خانەیەك کە زیاد دەبێت.

خانە وەك كۆپييەكى زۆر بچوككراوەى لاشە وايە، چونكە كاتێ لە جەستە و چەلاكييەكانى وردەبينەوە، لەناو خانەشدا زۆرێك لەو چالاكيانە دەبينين وەك هەرس كردن، هەناسەدان، دەرهاويشتن، كۆكردنەوەو هەموو چالاكييەكانى ديكەى ژيان، لەناو خانەشدا ئەو چالاكيانە لەلايەن كۆئەندامە جۆراوجۆرەكانەوە بێ دواخستن جێبەجێ دەكرێت.

خواى گەورە لاشەى مرۆڤى لەوپەڕى ڕێكوپێكى و جوانيدا بەديهێناوەو لەچوارچێوەى كۆمەڵێك سيستم و ياسادا كارەكانى بەڕێوە دەبات، هەريەكە لە خانەكانى لاشەش بەگوێرەى ئەو سيستمە كاردەكەن.

ئەوانەى بە تلێسكۆبى گەورەو مايكرۆسكۆبى ئەليكترۆنى لە ئەتۆمەكانى نێو گەردوون وردەبنەوە بۆيان دەردەكەوێت كە هەموو بوونەوەران بە تەرازوويەكى ورد بەديهێنراون و لەناو سيستمێكى ناوازەدا بەڕێوە دەبرێن، بە دەركردن بەم ڕاستيانەش تەسليمى خواى پەروەردگار دەبن".

ڕوونكردنەوەكانى كاك دۆغان زۆر ناوازە بوون. بەتايبەتى كۆتا ڕستەكانى كە دەيوت:"بۆچى ئێمە ناتوانين ئەم ڕاستيانە ببينين و بيريان لێ بكەينەوە. ئاخر ئەگەر ئەو زانستانەى لەخوێندنگاكاندا دەخوێنرێن بەشێوازێكى ڕاست و دروست ڕاڤە بكرانايە، ئەوا مرۆڤى

بێباوەڕ لەسەر زەویدا نەدەماو هەموو کەسێك لەناخەوە هاوسەنگ دەبوو.

کات زۆر تێپەڕی.

من نە لە خەونەکەداو، نە لە دونیاشدا بەنیاز نەبووم ئەم پیاوە بەجێ بهێڵم، بەڵام پێویست بوو بڕۆم. بڕیارمدا ئەم بابەتانە بۆ ئەو هاوڕێیانەم باس بکەمەوە کە وەکو من لە گەڕاندا بوون و لە کورتترین ماوەشدا بچینەوە سەردانی کاك دۆغان.

کاك دۆغان کاتێ لە دەرگاکەوە بەڕێی کردم، چاوەکانی وەکو ناخی گەشاوەبوو.

پاش ئەوەی لەگەڵ کاك دۆغاندا یەکترمان ناسی ئەو گفتوگۆیەی کردمان و ئەوەی گوێبیستی بووم لە خوێندنەوەی کتێبەکەدا، کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر جێهێشتم. دەستمکرد بە باسکردنی ئەو بابەتانە بۆ ئەو هاوڕێیانەم کە وەك من لە گوماندابوون. هەمووشیان بە گرنگییەوە گوێیان لێ ڕادەگرتم، زۆر بە پەرۆش بوون بۆ ئەوەی کاك دۆغان بناسن و دیمانەی لەگەڵدا ساز بکەن.

منیش سەدان بابەت هەبوون کە زیاتر پرسیاریان لەبارەوە بکەم و فێریان ببم.

ڕۆژێکی یەك شەممە لەگەڵ کۆمەڵێ هاوڕێدا بەیەکەوە بووینە میوانی ماڵی کاك دۆغان.

لە نێوماندا هاوڕێیەکی ناوداریشمان هەبوو کە لەگەڵ کۆمۆنیست و بێ باوەڕەکاندا هاوبیروڕا بوو و بەردەوام قسەی بۆ قوتابیەکانی دیکە دەکرد. ئەمیش حەزی بەو بابەتانە دەکرد. پێداگری کرد و وتی:"با منیش بێم". وتم: "ئەگەر ئەم هاوڕێیەمان بکەوێتە ژێر کاریگەری بیروڕاکانی کاک دۆغانەوە و بگەڕێتەوە، ئەوا لە قوتابخانە کاریگەری بیروبۆچوونی کۆمۆنیستی و بێ باوەڕی بە ڕادەیەکی زۆر کەم دەکات".

کاک دۆغان داواکەی پەسەند کردین، زۆر بەگەرم و گوڕییەوە پێشوازی لێکردین بەرەو ژوورێکی خاکیی ماڵەکەی کە زۆر ڕێك و پێك و ئامادە بوو.

هەر کە دەچوومە ئەو ماڵەوە هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد.

لەگەڵماندا یەك بە یەك خۆی ناساندو، دەنگ و باسی پرسین.

بەشێك لە هاوڕێکانم نەیانتوانی لەوە زیاتر خۆیان ڕابگرن و چاوەڕێی دەستپێکردنی گفتوگۆکە بکەن.

ئایدن، ڕابەری قوتابیان و ناسراوی قوتابخانەکەمان (لایەنگری بیروڕای کۆمۆنیستی) بابەتەکەی کردەوەو وتی: "منیان بانگهێشت کردووە بۆ ئێرە، پێیان وتوم لێرە وەڵامی هەموو پرسیارێك دەدرێتەوە. منیش هەندێ پرسیارم هەیە".

کاک دۆغان بەوپەڕی سادەییەوە وتی:

– استغفرالله، بانگەشەی ئەوەمان نەکردووە کە وەڵامی هەموو پرسیارێك بدەینەوە، بەڵام ئەگەر بابەتێك بێت کە بیزانین یارمەتیتان دەدەین.

– بە ڕەمەزانی هاورێمانت وتووە: خوای پەروەردگار بەدیهێنەری بوونەوەرە، بەڵام زۆرێك لە مامۆستاکانمان لەسەر هەمان بیروڕا نین.

مـن تەماشـای دەوروبـەرم دەکـەم. نـاتوانم بەدیهێنـەرێکی لـەو شێوەیە ببینم. بە ڕای من پێویست بەوەش ناکات بوونەوەر و دونیـا خۆی لـە خۆیـەوە نەخشـێندراوەو بـەڕێوە دەچێت، گـەڕان بـەدوای بەدیهێنەردا واتایەکی نییە.

کاك دۆغان دەستی کرد بە قسەو وتی:

– ئەمە پەیوەستە بەوەی کە چۆن تەماشا دەکەیت، هەرکەسـەو بەشێوازێك لەبوونەوەر دەڕوانێـت، بـەڵام پێویسـتە بـزانین زانسـت و قورئان لەبارەی ئەم بابەتەوە چی دەڵێن، چونکە خـاوەنی وتـە لـەم بابەتەدا ئەمانەن.

دیسانەوە یەکێك لە (پەیامەکانی نوور)ی بـە دەسـتەوە گرتـەوە. دەستی کرد بە خوێندنەوەی بەشێکی کتێبەکە:

"کتێبی بێ نووسەر شتێکی گەلێك مەحاڵە، بـە تایبـەت کتێبێکـی وەك ئەمەی کـە یـەك بەیـەکی وشـەکانی کتێبێکـی تـری بەخـەتێکی وردو، لـە ژێـر هـەموو یـەکێ لـە پیتەکانیـدا پارچـەیەك هـۆنراوەی بەقەڵەمێکی باریك تێدا نووسرابێتەوە..

جا هەروەك نەبوونی نووسەر بۆ کتێبی ئاوەها کارێکی مەحاڵە، بەهەمان جۆرو لە هەموو مەحاڵێ مەحاڵتریش ئەوەیە کە ئەم گەردوونە داهێنەرێکی نەبێت بەدیی هێنابێت، چونکە ئەم گەردوونە -لەڕاستیدا- کتێبێکی ئەوەندە مەزنە کە هەموو لاپەڕەیەکی چەندەها کتێبی تێدایە، تەنانەت هەموو وشەیەکی کتێبێکە بۆ خۆی و، هەموو پیتێکیشی پارچەیەك هۆنراوەیە.. ئەوەتا هەر تەنها ڕووی زەوی لاپەڕەیەکە لە کتێبەو بزانە چەندە کتێبی زۆری تێدایە!.. درەخت وشەیەکە، بڕوانە چەندە لاپەڕەی زۆرو زەبەندەی تێدا ڕیز کراوە!.. بەری درەخت پیتەو.. تۆوەکەیشی نوختەیە! لەم نوختەیەدا پێڕست و بەرنامەی کاری درەختێکی زەبەلاح بەرێکوپێکی دانراوە!

.... هەروەها وەك ناگونجێ خانووی بێ وەستا هەبێت. بە تایبەت ئەم خانەیەی کە بە ناوازەترین ئارایش و، بە قەشەنگترین و سەرسوڕهێنترین نەخش و نیگار ڕازێنراوەتەوەو، بە تەرزێکی بێ وێنە بنیات نراوە، بە ڕادەیەك کە هەموو یەکێ لە بەردەکانی ئەم خانەیە هونەری بنیاتنانی هەموو کۆشکەکەی تێدا بەرجەستە بووە.."[1]

---

١- کتێبی (وتەکان) بە زمانی کوردی / م. سەعیدی نورسی/ لا ٧٨-٧٩.

کاك دۆغان بە هێواشی کتێبەکەی داخست و دەستیکرد بە ڕوونکردنەوە و نموونە هێنانەوە بۆ پوختەی ئەو خاڵانەی کە باسی کردن .

– تەماشا بکەن هەموو ئیشێك لەچێوارچێوەی سیستەم و یاسایەکی دیاریکراودا بەڕێوە دەچێت. هەموو جووڵەیەك هێمایەکە بۆ حیکمەتێکی باڵا. هەموو شتێك بە پێوانەییەکی هەستیار بەدیدەهێنرێت. هیچ شتێك بێ سەروبەر نییە هیچ دروستکراوێك بێ هوودە دروست نەکراوە.

ئێوە دەپرسن: کێ هەموو ئەم بوونەوەرە ناوازانە بەدیدەهێنێت؟ ئەم چالاکییانە بەڕێوە دەبات، کێ ئەستێرەکان دەسوڕێنێتەوە بێ ئەوەی بەیەکیاندا بدات، ئەوەی دونیای کردووەتە لانکە بۆ گیانداران، ئەوەی ڕۆژی سات بە سات دەبەخشێتە ملیارەها گیانداران، کێیە؟ کێیە ئەو بەدیهێنەرەی کە مرۆڤ لە هێلکەیەکی پیتراوو سپێرمێك کە بەچاو نابینرێت دەهێنێتە بوون.

هەندێ کەس دەڵێن:"سروشت بەدییان دەهێنێت"... پێویستە لەوانە بپرسین کە بەم شێوەیە قسە دەکەن، ئایا سروشت چییە؟ بە کورتترین پێناسە دەڵێن:"سروشت بریتییە لە هەموو گیاندار و بێ گیانەکان". لەکاتێکدا کە دەڵێن سروشت بوونەوەرانی بەدیهێناوە، واتە ئەوەی ناوی بەخشیووە بە بوونەوەرانی گیاندار و بێ گیان، خۆی خاوەنی ژیری‌و، زانست‌و، هەست و توانا نییە.

لە کاتێکدا ئەوە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە، کە بێ گیانەکان ناتوانن بۆ خۆیان هیچ شتێك بکەن؟ لە ژوورێکدا چەکوش و، بزمارو، تەختە دابنێن، یەك ملیۆن ساڵ چاوەڕێ بکەن، لەو ماوەیەدا ئەگەر وەستایەکی خاوەن زانست و ژیری ئەمانە بەکارنەهێنێت، تەنانەت یەك سێ پا دروست نابێت .

پێویستە ئەوەش لەوانە بپرسرێت کە لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە سروشت بەدیهێنەر بێت: "کێ یاساکانی بوونەوەر و سروشتی داهێنا؟" بۆ وەلامی ئەم پرسیارە بەناچاری دەڵێن: "سروشت". ئەگەر پرسیاری دووەمیان لێ بکرێت: "سروشت بریتییە لە چی؟" وەلام دەدەنەوە و دەڵێن: "بریتییە لە بوونەوەرو یاساکانی سروشت".

ئینجا لەم بارودۆخەدا ئەوانەی کە لافی سروشتچێتی لێ دەدەن، کاتێك کە بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە بوونەوەر لە خۆیەوە بەدیهاتووە دەکەونە بارودۆخێکی پێکەنیناوییەوە، چونکە بەقسەی ئەوان ئەوەی نووسینەکە دەنووسێت نووسینەکەیە و، ئەوەی سێ پا دروست دەکات سێ پایە، واتە بەدیهێنەرو بەدیهێنراو هیچ جیاوازییەکیان نییە.

با واز لە نقومبوونی سروشتچییەکان بهێنین لە زەنگاودا و ڕوومان بەلای ڕاستیدا وەربگێڕین. بە سەرنجەوە تەماشابکە، سروشتیش نیشانەیەکی سەرسوڕهێنەری هونەرە. خۆی لە نەبوونەوە هێنراوەتە

بـوون‌و، بـه هـه‌زاره‌ها نـه‌خش ڕازێندراوه‌تـه‌وه کـه نه‌خشه‌سـازی به‌دیهێنه‌ره‌که‌ی نیشـان ده‌دات. سروشـت، ئـه‌وه‌ی کـه له‌سـه‌ره‌وه‌ی وێنامان کرد لـه نێـو دروسـتکراوه‌کاندا تابلۆیه‌کـه هاوتـای نییـه، بـه زمانی حاڵ هاوارده‌کات و ده‌ڵێت به‌دیهێنه‌رو نه‌خشه‌سازی من خـوای په‌روه‌ردگاره که خاوه‌نی زانستو، ده‌سـه‌ڵات و توانـای بـێ کۆتایـه، ئـه‌م ڕاسـتییه لـه ئاهـه‌نگی پـڕ ئـاوازی بوونـه‌وه‌ردا بانگه‌شـه‌ی بـۆ ده‌کرێت.

هاوڕێکـه‌مان، ئایـدن، به‌رپه‌رچـی ئـه‌م لێکدانـه‌وه جوانـه‌ی کـاك دۆغانی دایه‌وه:

– دونیـا، ئـه‌وه‌ی پێـی ده‌ڵـێن هێڵـی مه‌جـه‌ڕه پـڕن لـه کۆمه‌ڵـه ئه‌سـتێره. دونیـای ئێمـه‌ش سـه‌ر بـه کۆمه‌ڵـه ئه‌سـتێره‌ی ڕێگـای مه‌جه‌ڕه‌کانـه. هـه‌ر هێڵێکـی مه‌جـه‌ڕه بـه‌هۆی سیسـتمێکه‌وه ده‌سوڕێته‌وه. ئه‌و یاسایانه‌ی کێش کردنـی ئه‌مانـه بـه‌ڕێوه ده‌بـات. به‌دوای یه‌کدا هاتنی وه‌رزه‌کان‌و، شه‌و، ڕۆژ و سیستمی دونیاش بـه‌م سیستمی کێش کردنه به‌ڕێوه ده‌چێت، واته هه‌رچۆنێك بێـت ئه‌مانـه پێویستیان به خوا نییه تا به‌ڕێوه‌یان ببات...

کاك دۆغـان بـه‌هێمنی لاپـه‌ڕه‌کانی کتێبه‌کـه‌ی ده‌سـتی کـرده‌وه، وتی:

– با ئه‌و بابه‌ته‌ش لێره‌وه بخوێنینه‌وه.

بــه هێمنــی دەســتی خســته ســەر وشــەکان و دەســتی کــرد بــه خوێندنەوەی.

" گوڵــۆپی ئــەم زەوییــە کــە خــۆرە، پێکهاتــەی جەســتەی و یەکگرتوویەکەی کە بۆ خۆر پەنجەرەیـەکی درەوشـاوە و نوورانییـە. بـەڵێ، ئـەوەی پێـی دەڵـێن کۆمەڵـەی خـۆر، لەگـەڵ زەوییەکەمانـدا بەیەکەوە دوانزدە هەسـارەن : بارسـتەکانی، بە قـەبارەی گـەورە و بچــووك زۆر جــۆرا و جــۆر و پۆلــدارن، بــەپێی دووری و نزیکیــان لــەخۆرەوە بــە خێرایــی جیــاواز دەســوڕێنەوەو، بــە جوڵــە و دەورانەکانیان بەبێ لێ تێکچوون بـەدەوری خـۆردا بـەردەوامن، ئـەو دەسـتەواژەیەی پێـی دەڵـێن یاسـای کـێش کـردن و، بەسـتنەوەیان لەگەڵ یاسایەکی خواییدا، واتـە هێـزی ئـەوان بـۆ ئیمامەکـەیان ، لـە پێوانەیێکی گەورەدا دەسەڵاتی مەزنی پەروەردگار و تـاك و تـەنهایی خودا نیشان دەدات، چونکە ئەو هەسارە بێ گیانانە ئەو کۆمەڵە بـێ هەسـتانە، سـوڕانەوەیان لـە نـاو ئـەو پـەڕی سیسـتم و دانـایی و هاوسەنگیدا لە شێوە جیاوازەکان و لە مەودا جیاوازەکان و لە جوڵـە جیاوازەکاندایە بە بـێ پێکـدادان، ئەمـە سـەلمێنەری چ دەسـەڵات و داناییەکە بۆ ئەم کارە قورس و مەزنە ! ! ئەگەر بە هێندەی گـەردێك تێکچوون ڕووبـدات، ئـەوا تەقینەوەیـەکی وەهـا دروسـت دەکـات کـە جیهان پەرتەوازە دەبێت"

کاك دۆغان پاش ئەوەی ئەم بەشەی خوێندەوە کتێبەکەی داخست و، دەستی کرد بە ڕوونکردنەوەی بابەتەکە.

هەموومان بەسەرنجەوە گوێمان بۆ قسەکانی کاك دۆغان گرتبوو، چونکە ئەم بابەتانە زۆر گرنگ بوون. پێویست بوو لە دەستمان نەچێت:

لەمەجەڕەکاندا ٢٠٠ ملیۆن ئەستێرە هەن کە شاهیدن لەسەر دەسەڵات و تەنهایی بەدیهێنەرەکەیان.

خۆرەکەمان یەکێکە لە ئەستێرەی ناو مەجەڕەکان، مەجەڕەی (درب التبانە) یەکێکە لەو ١٠٠ملیار مەجەڕانەی ناو بۆشایی ئاسمان، کە تائێستا توانراوە بژمێردرێن. (درب التبانە) لەجۆری مەجەڕەی پێچ خواردووە. چەقەکەی شێوە بازنەییە، لەهەردوو لای بازنەکە کلکداری پێچ خواردووی لێ درێژ دەبێتەوە.

ئەستووری چەقەکەی ١٠هەزار ساڵی تیشکییەو، تیرەی مەجەڕەکەش ١٠٠هەزار ساڵی تیشکییە. ئەگەر ڕۆکێتێك بەخێرایی ١٠هەزار کم لەکاتژمێرێکدا بڕوات، لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی مەجەڕەکە بە ١٥ملیارو ٨٠٠ ملیۆن ساڵ گەشتەکەی تەواو دەکات.

لەناو ئەم مەجەڕەیەدا کۆمەڵێك ئەستێرە هەن بەناوی (ئەستێرە سوورەکان و ئەستێرە شینەکان). ئەستێرە سوورەکان زیاتر لەچەقەکەیدا کۆدەبنەوە، بەهۆی هەوری چڕو گازو تۆزی زۆرەوە

نابینرێن، تەنها بەهۆی خانە وێنەکارەباییەکان و فلتەرەکانی تیشکی ژێر سورو تلسکۆبی ڕادیۆیی دەتوانرێت ئاشکرا بکرێن.

سیستمی خۆرەکەمان لەچەقی مەجەڕەکەوە ٢٦هەزار ساڵی تیشکی دوورە، ئەو ٢٠٠ملیار ئەستێرەیەی کە مەجەڕەکە دەیگرێتەخۆ بەبەردەوامی لەسورانەوەدان، خێرایی ئەم سوڕانەوەیەش لەچەقەوە بۆ کۆتاییەکەی بەرەبەرە هێواش دەبێتەوە. کۆمەڵەی خۆرەکەمان بەخێرایی ٢٨٠کم/چرکەیەکدا بەدەوری چەقی مەجەڕەکەدا دەسوڕێتەوە. گەشتی ئەم سوڕانەوەیەش بە ٢٥٠ملیۆن ساڵ تەواو دەبێت بەمەش دەڵێن (ساڵێکی گەردوونی).

ئەمە سیستمێکی یەکجار سەرسوڕهێنەرە، کە ئەستێرەیەك هەم بە دەوری تەوەرەی خۆیدا دەسوڕێتەوە و هەم بە دەوری ناوەندێکی تردا بە خێرایی و ڕێك و پێکی لە گەڕاندایە. تەنانەت مرۆڤ کە خاوەنی کۆمەڵێك توانای عەقڵی و جەستەیییە لە هەمان کاتدا دوو ئیشی جیای بە ئاستەنگ بۆ دەکرێت. لەکاتێکدا ڕێگای کاکێشانمان بە ملیارەها ئەستێرەی لەخۆگرتووەو هەموویان لەچوارچێوەی سیستمێکی ڕێکوپێکدا بەڕێوە دەچن، بێ ئەوەی هیچ هەڵەو کەموکوڕییەك ڕووبدات، هەموو ئەو موعجیزەو حسابە وردو هەستیارانە جێگای تێڕامان و بیرکردنەوەن.

نکۆڵی کردن لەم وردەکاری و حسابانە، سەختترە لە چاو نکۆڵی کردن لە هەبوونی دونیا. لە هەر گۆشەیەکی دونیا بڕوانین بۆمان دەردەکەوێت کە بە تەرازوویەکی ورد بەدیهێنراوەو لەوپەڕی ئەندازەکاری و ڕێکوپێکیدایەو بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێت کە بە ڕێکەوت بەدینەهاتووە، بەڵکو داخوازی ئەوەیە کە دەستکردو بەدیهێنراوی تەنها یەك کەسی بەتواناو دانا بێت.

لە ئاسماندا موعجیزە گەلی زۆر ناوازەو سەرسوڕهێنەر ڕوودەدەن. چاو پێویستە بۆ بینینی ئەو شتانە، زمان پێویستە بۆ خوێندنەوەیان، مێشك پێویستە بۆ بیر لێکردنەوەیان. مرۆڤ هەم پێویستە پاشای دونیا بناسێت، هەم بزانێت ڕێبواری کوێیەو تێبگات لە ژێر فەرمانی چ لێپرسینەوەیەکدایە.

***

بە تەواوبوونی بابەتەکە، لە سەرەتاوە لە ئایدنەوە چاوم بەسەر هاوڕێکاندا گێڕا، هەموویان لە سەرسامی و بێ دەنگییەکی قووڵدا بوون.

ئایدن پرسیارێکی تری پرسی، کە لە مێشکی منیشدا دەهات و دەچوو:

– گریمان خودا بوونی هەیە و بەدیهێنەری ئەم دونیایەیە، مرۆڤ دەتوانێت لەم بارەیەوە بگات بە چەند ڕاستییەك، بەڵام ئەوەی کە مرۆڤ ناتوانێت بەئاسانی لێی تێبگات زیندووبونەوەی دوای مردنە.

بەبۆچوونی مـن مرۆڤێك کـە ڕزی بێـت و بووبێتـە خـۆڵ، ناگونجێـت سەرلەنوێ زیندووببێتەوە. سەبارەت بەم بابەتە چی دەڵێن؟

وەڵامی ئەم پرسیارە بۆ هەمووومان گرنگ بوو.

کاك دۆغان، پێش ئەوەی بەسەر وەڵامـی پرسـیارەکەدا تێپـەڕێت چـایی هێنـا. بـە گرنگـی پێـدانێکی زۆر و میـوان دۆسـتیەوە پەرداخەکانی لەبەردەماندا دانا و شەکری بۆ یەك بە یەکمان گرت.

بـەو هاوڕێیـەمانی وت کـە ویسـتی کـاری دابەشـکردنی چاییەکان بگرێتە ئەستۆ:

– نەخێر نابێت، ئێوە میوانن، پێویستە من خزمەتی ئێوە بکـەم. لـەم ماوەیـەدا ئـەو هاوڕێیانەشـی جگـەرە دەکێشـن دەتـوانن جگەرەکانیان داگیرسێنن. هیچ گرفتێکی بۆ من نییە.

بـەڵام هاوڕێیـان وەك ئـەوەی بڵێـی جگەرەکێشـانیان دەبێتـە بێ ڕێزی جگەرەیان نەکێشا.

کـە کـاتی چـایی خواردنـەوە تـەواوبوو، کـاك دۆغـان سـەرلەنوێ کتێبەکـەی کـردەوە و، دەسـتی کـرد بـە خوێندنـەوەی بەشـەکانی پەیوەست بە بابەتەکەوە. ئێمەش هێشتا بە سـەرنجەوە گوێمـان بـۆ ڕاگرتبوو.

ئـەو باسـەی کـە خوێندیـەوە، بەشـێکی کتێبـی "وتـەکان" بـوو بەناوی "پـەیامی حەشـر" کـە ڕوونکـەرەوەی ژیرانـە و مەنتقییانـەی زیندووبوونەوەی پاش مردن بوو.

بەشێوەیەکی زۆر جوان و ناوازە بابەتەکەی ڕوونکردبووەوە، باوەڕ بکەن یەکەمجار بوو ئەوەندە هەست بە نزیکی بکەم لە مردن و، حەشرو، بەهەشت و جەهەنەمەوە.

بەتایبەتی ئەو بەشەی کە لە کۆتاییدا خوێندییەوە.

کاتێ ئەو بەشەی دەخوێندەوە تەماشای ئایدنم دەکرد. ئایدن سەری شۆڕ کردبووەوە بۆ زەوی. وەك ئەوەی بڵێی بۆچی پێشتر ئەو بابەتانەی بۆ باس نەکراوە.

کاك دۆغان دیسانەوە کتێبەکەی داخستەوە و دەستی کرد بە ئەو لێکدانەوەی ئەو نموونە جوانانە.

گفتوگۆکە زۆر بەرهەمدار و کاریگەر بوو.

بابەتی (زیندووبوونەوەی پاش مردن) ئەوەندە بەسوود و قایلکەر بوو، ئەو ئایدنەی کە زۆر متمانەی بە خۆی و بیروبۆچوونەکانی هەبوو، بەبێ دەنگی دانیشتبوو. لەڕاستیدا ئەوانەی باس دەکران و ڕوون دەکرانەوە زۆر سەرسوڕهێنەر و ناوازەبوون .

منیش پرسیارێکم لە کاك دۆغان کرد وتم:

– کاکە دۆغان، خودا ئێمەی بەدیهێناوە. ناردووینی بۆ دونیا. لەم دونیایەدا چۆن ژیان و قەدەرمانی نووسیوە، خێر و شەڕیشی نووسیوە. ئەو کاتە ئێمە تاوانمان چییە؟ ئەگەر قەدەری باش بنووسینایە بە شتی باشەوە ژیانمان دەبردەسەر، بەڵام لەبەر ئەوەی خراپەی نووسیوە بە شتی خراپەوە ژیان دەبەینەسەر و

دەبینە مرۆڤی خراپەکار؟ پاشانیش لەسەر خراپەکردن لێمان دەپرسێتەوەو سزامان دەدات؟ ئایا ئەمە دادپەروەرانەیە؟

دیسانەوە کاک دۆغان بەخوێن ساردیو بە هەڵسوکەوتە سەنگین و کامڵەکەیەوە دەستی کردەوە بە قسەکردن. وتی:

- بابەتی قەدەر زۆر کات بە هەڵە باس دەکرێت یان بە هەڵە ڕووندەکرێتەوە، بۆئەوەی بابەتەکە بە تەواوی و ڕوونی باس بکرێت، پێویستە لەسەرەتاوە باسی بکەین.

کاک دۆغان پرسی:

- بابەتەکە کەمێك دووروودرێژە، کاتتان چۆنە؟

کە ئێمە ئاماژەمان بە بەردەوام بوون دا، دەستی کرد بە درێژەدان بە ڕوونکردنەوەکانی:

- ئەگەر بە وردی بیر لە بابەتەکە بکەینەوە، ئەوا پێویستە ئاماژە بە سێ چەمکی گرنگ بکەین: قەدەر، قەزا، ئیرادە.

قەدەر، زانستی نووسراوی خوای پەروەردگارە، واتە هەموو ئەو کارانەی مرۆڤ لە ژیانی دونیادا ئەنجامیان دەدات لە (لوح المحفوظ)دا نووسراون.

قەزا سەرەتای هاتنی قەدەری نووسراوە، واتە جێبەجێکردنی فەرمانێکی قەدەرە.

ئیرادەش، توانای هەڵبژاردنە لە مرۆڤدا.

دەتوانین قەدەر بکەین بە دوو بەشەوە: قەدەری خۆنەویستو، قەدەری خۆویست. لە قەدەری خۆنەویستدا ئێمە هیچ کاریگەرییەکمان نییە، تەواو لە دەرەوەی ویستمانەوە نووسراوە؛ وەك شوێنی لەدایك بوونمان، دایکمان، باوکمان، شێوەمان، خۆمان ناتوانین بڕیار لەسەر ئەمانە بدەین، لەهەمان کاتدا لە بەرامبەر ئەم جۆرە قەدەرە بەرپرسیار نین. دووەم بەشی قەدەریش بەستراوە بە ویست و توانای خۆمانەوە؛ ئێمە بڕیار بۆچی دەدەین و چی دەکەین خوای پەروەردگار بە زانستی ئەزەلی زانیویتیو، بەو شێوەیە نرخاندوویەتی.

خوای پەروەردگار بە زانستی ئەزەلی زانستی بە ڕووداوەکانی داهاتوو هەبووەو تۆمارکراون. ئەمەش نامۆ نیە، چونکە خوای پەروەردگار کاتی بەدیهێناوەو، زاناو ئاگادارە بە هەموو ساتەکانی. زانستی بێسنوورو ناکۆتای خوای گەورە، کات و شوێنیشی گرتووەتەوە. دوێنێو ئەمڕۆ و سبەینێ بۆ ئێمەیە. ئێمە لەسنووری کاتدا دەژین، چونکە خۆیشمان وەکو کات و هەموو بەدیهێنراوێکی دیکە بەندەو بەدیهێنراوی خوای گەورەین و خاوەنی زانستێکی شاراوەی داهاتووش نین. بەدیهێنەریش هەرگیز لە بەدیهێنراوەکەی ناچێت. ئەوە ئەوپەڕی نەفامییە کە یەکێك بڵێت من داهاتوو نازانم، کەواتە خوداش نایزانێت؟

بابەتـــەکانی دەوڵەمەنـــدی و هـــەژاری، جـــوانی و ناشـــیرینی، لەشســاغی و نەخۆشــی، هــەموویان قــەدەری خۆنەویســتن. زۆرجـار خەڵکی بەبێ بیرکردنەوە ئەم جیاوازیانە بەستەم لەقەڵەم دەدەن، لە کاتێکدا ستەم پێشێلکردنی مافێکـە، بەنـدەش هـیچ مـافێکی بەسـەر خوداوە نییە. خوای گەورە بە بەزەیی و ڕەحمـەتی خـۆی چـەندەها نیعمــەتی جۆراوجـۆری پێبەخشـیوین بـۆ ئـەوەی سوپاسـگوزاربین لەسەر ئەو نیعمەتانەو، کە کۆمەڵێك نیعمەتیشی پێنەبەخشـیوین بـۆ ئـەوە نیـە کـە حـەز لـە یـاخی بـوون بکـەین، بـەڵکو بۆ ئەوەیـە کـە ئارامگربین و لەسەر ئەوەش پاداشتمان بداتەوە. کەموکوڕییەکان بـۆ تاقیکردنــەوەی بەندەیــە. ئەگــەر دونیــا بشــوبهێنین بــە هــۆڵێکی تاقیکردنـــەوە، کەموکوڕییـــەکان یەکێکـــە لـــە پرســـیارەکانی تاقیکردنەوەکـە. ئایـا بەنـدە یـاخی دەبێـت، یـاخود سوپاسـگوزاری لەسەر ئەو نیعمەتانە دەکـات کـە پێـی بەخشـراوەو، ئـارام دەگرێـت لەبەرامبەر بێبەشبوونی لە کۆمەڵێك نیعمەت. با بـیر لـە بازرگـانێکی دەوڵەمەند بکەینەوە؛ تەنها لەبەر بەزەیی دەیەوێت چاکە لەگەڵ دوو هەژاردا بکات کە دێنە دوکانەکەیەوە. کراس و پانتۆڵێك بە یەکێکیان دەبەخشـێت، کـراس و پـانتۆڵ و چـاکەتێکیش پێشـکەش بـەوی دیکەیان دەکات. ئایا ئـەو پیـاوەی کـە تـەنها کـراس و پانتۆڵەکـەی وەرگرتووە دەتوانێت بە بازرگانەکە بڵێـت تـۆ سـتەمت لـە مـن کـرد، زیاترت بە پیاوەکەی دیکە بەخشی؟ ئەگەر بیڵێت ئایا ئـەم قسـەیەی

نابێتـه بـێ ڕێـزی؟ ئێمـەی مـرۆڤیش لـەم هەزارانـه دەچـین. خـوای پەروەردگار له گەنجینەی نەبڕاوەی نیعمەتەکانمان پێ دەبەخشێت.

لاشەمان، مێشکمان، خەیاڵمان، ئەو هەوایەی هەڵی دەمژین، ئـەو ئـاوەی دەیخۆینـەوە، ئـەو خۆراکـەی دەیخـۆین خـوای پـەروەردگار بەدیهێناون. ئەگەر ئەو کەسانەی بێبەشکراون له ژمارەیەك نیعمـەت ئارام بگرن، ئـەوا نیعمـەتانێکی هەتاهـەتایی بەدەستدەهێنن. دونیـا بریتییه له تاقیکردنەوەیەکی کورت... ئەگەر ئەو بەندەیەی نیعمەتی کەمی پێبەخشراوە، بێ ئەدەبی بکات و بڵێت ستەمم لێکراوە ئـەوا دەچێته ڕیـزی یاخیبوانـەوە، لەئەنجامـدا سـزا دەدرێـت، چـونکه لـه بنـەمادا ئەرکەکـەی ئەوەیـه کـه سوپاسـگوزار بێـت لەسـەر ئـەو نیعمەتانـەی پێـی بەخشـراون. خـوای گـەورە لـه هـەموو ئیشـێکیدا دادپـەروەرە، هـەرگیز سـتەم ناکـات. پێویسـته لـەم گۆشـەیەوە تەماشـای بـەڵاو نارەحەتیـەکانیش بکرێـت؛ بـەڵاو نارەحـەتی یـان ئـەنجامی تاوانێکـە کـه ئـەنجاممان داوە یـاخود بەرهـەمی تاقیکردنەوەیە. ئەو کەسەیماڵی دەسوتێنرێت، پـێش ئـەوەی بڵـێ ئـەوە لەچـارەم نووسـراوە، تەنانـەت ئەگـەر هۆکارێـك نـەبێت کـه بیزانێـت، بـا هێشـتا لـه خۆیـدا بـۆ تاوانەکـه بگـەڕێت. ڕەنگـه دڵـی کەسـێکی شـکاندبێت! ئـەوەی مـاڵی دەسـوتێنێت تـاوانێکی ئەنجامداوە، بەڵام قەدەری خودایی دادپەروەرانەیە.

ئایا قـەدەر دەگۆڕێـت؟ ئەڵقەیـەکی زنجـیرەی پرسـیارەکانیش ئەمەیـە. بینیومـە کاتێـك کەسـێك کارێـك دەکـات بـە وازهێنـانی لـە ناکاوی لەو کارەو دەستکردن بە ئەنجامدانی کـارێکی تـر، وتوویـەتی ئەوەتا قەدەرمم گۆڕی. لە هەر جارێکیدا پێکـەنیووم و وتوومـە کـە: تۆ قەدەرت ناگۆڕیت ئەو کارە دەگۆڕیت کە کردووتـە. وەك بەلـەمێك وایت کە لە ئۆقیانوسی قەدەردا سەر ئاو کەوتوویت. ئەو کەسەی کە سەرەتا نووسەرە ئەگەر دوای ماوەیەك دەست بکات بە گۆرانی وتـن ئەوا قەدەری ناگۆڕێت. تێدەگەین کـە لـە قەدەریـدا پێشـتر نووسـین هەیـە، پاشـانیش بڵێـت ئـەوەتا قـەدەرم دەگـۆڕم و گـۆرانی دەڵێم. کارەکـان لـە خـۆی دەگۆڕێـت، بـەڵام نـە وشـەیەك لـە قـەدەر دەسڕێتەوە، نە وشەیەکی نوێیش دەنووسێت. ئـەوەی بـە گـۆڕینی شوێنی ئاوێنەیەك، دارێك نیشان بـدات، ناتوانێـت شـوێنی دارەکـەش بگۆڕێت.

خـوای پـەروەردگار هـەروەك چـۆن خێـرو باشـیی و جـوانیی بەدیهێناوە، لەهەمان کاتدا شەڕو خراپیشـی بـەدیهێناوە. خـەڵکانێك هەن دەڵێن:"بۆچـی خـودا شـەڕی بـەدیهێناوە؟" گوایـە بەلایانـەوە سەیرە کە خودا شەڕ بەدیبهێنێت. با خێـرا بپرسـین: ئەگـەر خـودای پەروەردگار بەدینەهێنێت، کێ بەدیدەهێنێت؟

بـەدیهێنان تایبەتـە بـە خـوای پـەروەردگارەوە و کارەکەشـی لێکچوو، یارمەتیدەرو، هاوتـای نییـە. ئەمـە ڕوویـەکی ئـەم بابەتـە.

لەلایەکی دیکەشەوە ئەگەر خوای پەروەردگار بە تەنها خێری بەدیبهێنایە، شەڕ بوونی نەدەبوو، ئەو کاتە تاقیکردنەوەش واتایەکی نەدەما. کەوتنە ناو حەرام و، تاوان کردن و، نکۆڵی کردن ڕوویان نەدەداو، هەموو کەسێ بە ناچاری وەك فریشتە دەبوو. هەڵبەت ئەمە خواستی خوای پەروەردگارمان نییە، خوای گەورە ویست و ئیرادەی بەمرۆڤ بەخشیوە. ئەو دەخوازێت ئاراستەی بکات بۆ خێر. بەم هۆیەوە خواست چی هەڵبژێرێت ئەوە بەدیدەهێنێت، بۆ نموونە بەپێ بۆ مزگەوت دەڕۆین، هەروەها بۆ مەیخانەش. یەکەمیان خێرە، دووەمیان خراپەیە. خوای پەروەردگار بەپێی خواستی بەندەکەی بەدیدەهێنێت. ئەگەر ئەو پێیانەی بەرەو مەیخانە ئاراستە دەکرێن ببڕانایەو، ئەو چاوانەی کە مەیلیان بۆ حەرامە کوێر بوونایەو، ئەوانەی پەرستش ئەنجام نادەن تووشی نەخۆشییەکی دیاری کراو بوونایە، ئەوا ویست و ئیرادەی بەندە مانایەکی نەدەما. لەو بارودۆخەدا بۆ جیاکردنەوەی چاکەکان لە خراپەکان، خوای گەورە لەتەك چاکەدا خراپەشی بەدیهێناوە.

هیچ شتێك ناتوانێت وەکو باوەڕو متمانە بە بەدیهێنەری بوونەوەر زەوق و شەوق بە مرۆڤ ببەخشێت.

پاش قسەکانی سەبارەت بە قەدەر، ئایدن دووبارە خۆی هاویشتەوە مەیدان، وتی:

– دەتوانم بڵێم بابەتەکانت بەسوود بوون بۆ من.

کات زۆر درەنگە، بەڵام دەمەوێت سەبارەت بە (ڕۆح) پرسیار بکەم، کە بە چاو نابینرێتو بە دەست ناگیرێت، بابەتێکە کە زانستیش شتێکی لە بارەوە نەوتووە.

ئایا ڕۆح بوونی هەیە؟ هەموو گیاندارێك خاوەنی ڕۆحە؟ ئەو کەسەی دەمرێت دووبارە ڕۆحی دەکرێتەوە بەبەردا یان دەچێتە لاشەیەکی ترەوە؟ دەربارەی ئەو بابەتەش ئەندێشە و گومانمان هەیە.

ئەم پرسیارەی لە جێگای خۆیدا کرد. زۆر پێویستمان بەمەش هەبوو. لەو باوەڕەدام کە ئەو وەڵامەی دەیداتەوە دیسان ئێمە دڵخۆش دەکات، تەمی ئەو گومانەشمان دەڕەوێتەوە.

کاك دۆغان دیسان بە دەنگێکی ئارامەوە دەستی کرد بە وەڵامدانەوە:

– مرۆڤ ڕۆحی هەیە. بوونی ڕۆح بەڵگەی زۆری لەسەرە.

مرۆڤ بە ڕۆح و جەستەوە هاتۆتە گۆڕەپانەکەوە. ڕۆح بوونێکی شاراوەیە، واتە لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانین بوونی هەیە، نازانین ماهیەتی چۆنە. ئەوەتا خوای گەورە لە قورئاندا بە پێغەمبەری فەرمووە: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً ﴾الإسراء: ٨٥.

واتە: "پرسیارت لێدەکەن سەبارەت بە ڕۆح. پێیان بڵێ: ڕۆح لەو مەخلوقانەیە کە بە ئەمرو فەرمانی خوای گەورە پەیدابوون و، هەر

خودا خۆی دەزانێت چیە، ئێوە ئەندازەیەکی کەم نەبێت زانیاریتان پێ نەدراوە" کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ هەبوونی ڕۆح و شاراوەیی ڕۆح.

واتە ڕۆح زیندووە خاوەنی هەستە، نوورانییە، لاشەیەکی ڕاستەقینەی هەیە، بەتوانایە، خەیاڵێك نییە و، ڕاستییە، توانای تەواوی کەسبییەتی هەیە. هەرچی یاسا و فەرمانیشیەتی لە جەستەدا جیاوازییەکانی ئاشکرایە. لەبەرئەوەی لاشە لە جیهانی مادییدایە. ڕۆحیش ڕاستەوخۆ لە ژێر فەرمانی خوای پەروەردگاردایە. سەرنج بدەن بەدیهێنان و فەرمانیشی لە خوای پەروەردگارەوەیە ئایەتی (ئەعراف: ٥٤)، ئیشارەت دەدات بۆ سەرچاوەی جیاوازی جەستە و ڕۆح.

"لاشە نیشتمانی ڕۆحە. لەم نیشتمانەدا پادشای ڕۆح فەرمانڕەوایی دەکات. ڕۆح هەموو ئەندام و هەستەکان بەکاردەهێنێت. بۆ نموونە چاو ئەندامێکە کە ڕۆح بەو پەنجەرەیە سەیری ئەم جیهانە دەکات". (وتەکان)

ڕۆح لە مرۆڤدا خاوەنی ژیان و هەستە. پێش ئەوەی بێتە ناو لاشەوە لە جیهانی ڕۆحەکاندا چاوەڕێ دەکات. پاش ئەوەی جەستە ڕۆحی بە بەردا کرا هەموو کارێکی بە لاشە دەکات. بە درێژایی تەمەنی دونیا لە لاشەدا دەست بەسەرە. لە ساتە وەختی مردندا لە زیندانی لاشە ڕزگاری دەبێت، لاشە وەك جلی ڕۆح نییە، جۆرە ماڵێکە. پاش مردن پێویستی بە هیچ هۆکارێکی هەستی بینین،

بیستن، تێگەیشتن، زانین، هەست کردن نابێت. ڕۆحەکان تا ڕۆژی دوایی لە جیهانی بەرزەخدا چاوەڕێ دەکەن. ڕۆح لە کاتی ئەو چاوەڕوانییەدا یان لە بەختەوەرییدا دەژی یاخود سزای گۆڕ دەچێژێت. هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (گۆڕ یان باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت، یاخود چاڵاییەکە لە چاڵاییەکانی جەهەنەم). بە دڵنیاییەوە ڕۆژی دوایی لە مەحشەردا ڕۆح دیسانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لاشەیەی کە تیایدا بەدیهێنرابوو، مرۆڤ لەو دادگا گەورەیەدا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەر ئەو کارانەی لە دونیادا ئەنجامی داون.

ئیحسانی هاوڕێمان هاتە نێو ئەم گفتوگۆ شیرینەوە. وتی:

- بابەتێك هەیە کە دەڵێن: ڕۆح بانگ دەکرێت. ئایا ڕۆحی مرۆڤ بە بانگ کردن دێت؟.

کاك دۆغان لەم ڕوانگەیەوە بەردەوامی بە ڕوونکردنەوەکەی دا:

ئەوانەی خەریکن بە بانگ کردنی ڕۆحەوە، بۆ دانانی پەیوەندی لەگەڵ ڕۆحی مردووەکاندا، لەو جۆرە بانگ کردنەدا باوەڕ بە وەڵامی ئەو پرسیارانە دەکەن کە بە حساب ڕۆحەکە وەڵامیان دەداتەوە.

هەرچەندە دانیشتنەکانی بانگکردنی ڕۆحەکان بۆ مەرامی جۆربەجۆر بەکاردەهێنرێت، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەگەر ئەو ڕۆحەی کە بانگ دەکرێت ڕۆحی مرۆڤێکی کافر یان تاوانکار بێت ئەوا نایەت، چونکە ئەو لەبەر ئەو کردەوە هەڵانەی لەژیانی دونیادا

ئەنجامیداون، خەریکی چەشتنی سزای قورسی ناو گۆڕە. ئازاد نییە تا بچێت بۆ هەر جێگایەك كە ئارەزووی دەكات. وەك لە دونیادا هیچ بوونەوەرێك بێ سەروبەر نییە، ڕۆحەكانیش بێ سەروبەر نین. خۆ ئەگەر ئەو ڕۆحەی كە بانگ دەكرێت ڕۆحی كەسێك بێت كە لە دونیادا كردەوەی خێری كردبێت و ڕەزامەندی خوای پەروەردگارو بەختەوەری هەتا هەتایی بەدەستهێنا بێتو، لە جیهانی مەلەكوتدا ژیانێكی بەهەشت ئاسا ژیابێت ئەوا دیسان نایەت. ئەم ڕۆحانە كە لە ژیانی دونیادا لە گەمە قێزەونەكانی شەیتان دووربوون و، تامی بەختەوەرییان لەو دونیا چەشتوە، ئەوا بەدوورن لەوەی بێنە ناو جەلسەی بانگكردنی ڕۆحەكان و ببنە گەمەی دەستیان. بە تایبەتیش ئەم ڕۆحانەی كە خۆری جیهانی مرۆڤایەتین، ئەوانەی لە پلەی پێغەمبەرەكان یان لەگەڵ ئەواندا بە تەبایی بڵندییان بەدەست هێنابێت و سەریە ئەولیاكان بن هیچ گونجاو نییە؟

محەمەد هەر سەبارەت بەم بابەتە پرسیارێكی دیكەشی پرسی وتی:

– ئایا دانانی دیدار و یەكتر بینین لەگەڵ ڕۆحەكاندا گونجاوە؟ پەیوەست بەمەش هەندێ قسە دەبیستین.

كاك دۆغان وەڵامێكی كورتی بۆ ئەمەش دایەوە :

– دیدار لەگەڵ ڕۆحەكاندا گونجاوە. ئەویش لە ڕێگای ئیمان و پەرستش لە پلەكانی واتاییدا، ئەو وەلیانەی بەرزدەبنەوە لەگەڵ

ڕۆحە پیرۆزەکانداو گفتوگۆ دەکەن‌و، وانە وەردەگرن. ئەگەر ئەمە دەربڕینیش بێت ئەوا لەگەڵ ئەوانەی ڕۆحەکان بانگ دەکەن جیاوازن. ئەوانە دوورن لە تاوانی بانگ کردنی ڕۆحە پیرۆزەکان. بە پێچەوانەوە ڕۆحە پیرۆزەکان بە بەرزبوونەوەیان لەگەڵ گیان لەدەستدانیان دەچنە بەردەم ئەو ڕۆحانەی کۆچیان کردووە بۆ بەرزەخ. ئەو ڕۆحانەی سەربە پێغەمبەران، پیاوچاکان، موتەکییەکان، دونیا دەگەڕێن، داخوازییەکانی تەمەسول دەکەن، بەرچاو دەکەون، جار جار یارمەتی ئەوانە دەدان کە پێویستیان بە یارمەتییە، بەرەکەت دابەش دەکەن بەسەر ئەوانەی دەیان بینن و شایستە بن. هەموو ئەمانە بە ئیزنی خوای پەروەردگار دەبن. بانگهێشت کردنی ئەو ڕۆحە پیرۆزانە بۆ مێزەکانی ئامادەخواری ڕۆحەکان چەندە ڕەوشتێکی جیاوازە، پێویستە بیر بکرێتەوە! ئەوانەی دەیانەوێت لەگەڵ ڕۆحەکاندا پەیوەندی بنیات بنێن، پێویستە وەکو ئەستێرەی یەك بە یەکی وەلێتی ئیمامی ڕەبانی، مەولانە جەلالەددین، جەلالەددینی سویوتی و محێددینی عەرەبی وابن. بێجگە لەمانە گاڵتەچێتییە.

ئیحسانی هاوڕێمان لەم بەشەی گفتوگۆکەدا بە دەستکەوتنی بۆشاییەکی بچووك هەلی لە دەست نەداو پرسی:"ئایا جنۆکەش هەن؟".

کاك دۆغان وەڵامی ئەم بابەتەشی دایەوە:

- جنۆکە بەدیهێنراوی خوای گەورەن، جیهانێکی نادیارو پەنهانن لەئێمە، بەچاوی سەر نابینرێن. هەروەك لەقورئانی پیرۆزدا ئامـاژەی پێکراوە جنۆکە لە بڵێسەی ئاگر دروسـتکراوە. لـە قورئـانی پـیرۆزدا ئایـەتی زۆر بـاس لـە جنۆکـە دەکـات، بەتایبـەتی سـورەتی (الجـن) تایبـەت کـراوە بەوانـەوە. توانـا و زیرەکیـان لەگـەڵ هـی مرۆڤـەکان لەیەك دەچێت، هەندێ تایبەتمەندی تریشیان هەیـە. لـەدونیادا وەك چـۆن مرۆڤـەکان تاقیدەکرێنـەوە بەهـەمان شـێوە جنۆکـەکانیش لـە تاقیکردنەوەدان. بێجگە لە ئیبلیسی نەفرین لێکراوو دارو دەستەکەی کـە بـەهۆی مـل نـەدانی بـۆ فـەرمانی خـوای گـەورە لەبەهەشـت وەدەرنراو، بۆ هەتا هەتایە لە ڕەحمەتی خوا بێبەش کرا.

قورئـانی پیرۆزیـش کتێبـی ئەوانیشـە، پێغەمبـەری ئازیزمـانﷺ فـەرمانی ئـەوەی پێکـراوە کـە مرۆڤـەکان و جنۆکـەکانیش ئاگـادار بکاتـەوە. لـە سـورەتی (الجـن)دا ئامـاژە بـەوە کـراوە کـە کۆمـەڵێك جنۆکە گوێیان لـە قورئـان خوێنـدنی پێغەمبـەری ئـازیزﷺ دەبێـت و ئیمان دەهێنن. جنۆکەی کافر و تاوانکاریش هەن کـە نـاوی شـەیتان لەمان نراوە. باوکی ئەمانەش ئیبلیسە. بەهۆی ئەوەی کە کڕنووشـی ڕێزی بۆ حەزرەتی ئادەم نەبردو لـە خـوای پـەروەردگار یـاخی بـوو، بوو بە دوژمن. کارەکـەی ئەوەیـە کـە تێدەکۆشـێت بـۆ گـومڕاکردنی مرۆڤـــەکان و جنۆکـــە باوەڕدارەکـــانی هاوڕەگـــەزی. جنۆکـــە شەیتانیەکانو، مرۆڤە شـەیتان ئاسـاکان دەسـت لـەناو دەسـت کـار

دەکەن‌و لە هەموو کارێکدا یارمەتی یەکتر دەدەن‌و، ڕاوێژ بەیەکتر دەکەن.

زەکی هاوڕێشمان پرسیارێکی سەبارەت بە جۆرەکانی جنۆکەو تایبەتمەندیەکانیان کرد.

دیسانەوە کاک دۆغان بەباشی وەڵامی ئەو پرسیارەشی دایەوەو وتی:

– لە سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکاندا هاتووە کە جنۆکەکانیش وەك گیانلەبەران جۆراو جۆرن. ناوی عفریت نراوە لە درندەکان، نشینگەی ئەمانە لە ژێر زەویدایە. جنۆکەکان لە هەندێ سیفەتدا لەمرۆڤەکان دەچن و، لە هەندێ لایەنیشەوە زۆر جیاوازن. جنۆکەکان تەمەن درێژن، دەتوانن بە چەند شێوەیەك خۆیان نمایش بکەن. توانای لاسایی کردنەوەیان زۆرە. هەندێ لە زانایان دەڵێن: جنۆکەکان نێرەو مێیەیان هەیە. بەشێکی دیکەی زانایان دەڵێن: جنۆکەکان خاوەنی ڕەگەز نین، بە کۆمەڵ دەژین. جنۆکە موسوڵمانەکان کاتێ درێژە دەدەن بە ژیانی پەرستش و تاعەتیان، کافرەکان (شەیتان) لە نزیکیان نامێننەوە .

هەندێ کەس پێیان وایە لە دانیشتنەکانی (ئامادەخوازی ڕۆحدا) لەبری ڕۆحی مردوو شەیتانەکان بانگ دەکەن، لەبەرئەوەی تواناو دەسەڵاتی تایبەتیان هەیە.

لەكاتێكـدا ئـەو بۆچـوونانە هـیچ بنەمایـەكی ڕاسـتیان نیـەو، جنۆكەكان هیچ دەسەڵاتێكیان بەسەر جیهانی مرۆڤەكاندا نیە، تـەنها توانـای شـەیتانیش وەك لـە قورئانـدا ئامـاژەی پێكراوە بریتییـە لـە دروستكردنی وەسوەسە بۆ مرۆڤ.

ئایدن بە پرسیارێكی گرنگ بردینیەوە سەر بنچینەی باسەكە:

– لای ئێمە كاهینەكان هەبوون. دەڵێن ئەمانە لەگەڵ جنۆكەكاندا بەیەكـەوە بـوون و هەنـدێ جـار ئیشـیان پـێ كـردوون. ئایـا ئەمـە گونجاوە؟

– ئەگـەر بڵـێین مێـژووی پەیوەنـدی لەگـەڵ جنۆكەكانـدا، بـە هێنـدەی مێـژووی مرۆڤایـەتی كۆنـە، ئـەوا نابێتـە زیـادەڕەوی. لـە ڕابردوودا ئەم جۆرە كەسانە پێیـان دەوتـرا كـاهین یـاخود سـاحیر. كاهینەكان و ساحیرەكان، لەگەڵ یەك جنۆكە یان چەند جنۆكەیەكدا پەیوەندییان دادەنا. هەواڵیان لێیانەوە وەردەگرت، ئەوەی لێیانەوە فێر دەبوون بۆ كەسەكانی تریان باس دەكردەوە. جنۆكەكان هەر بە هێنـانی هەواڵـەكانی ڕابـردوو نەدەوەسـتان، هەنـدێكیان دەچـوونە ئاسمـان و، بـۆ وەرگرتنـی زانیـاری دەربـارەی داهـاتوو بـە دزییـەوە گوێیـان لـە فریشـتەكان ڕادەگـرت، لـە ڕێگـای ئـەو كاهینـەی كـە پەیوەندی لەگەڵ جنۆكەكاندا دانابوو ئەو زانیارییانەیان دەگواستەوە بۆ مرۆڤەكان. لە سەردەمی ناردنی قورئاندا بۆ پێغەمبەری ئازیزمـان ڕێگاكـانی ئاسمـان داخـران. بـەو شـێوەیە ڕێ لـە زیـان گەیانـدن بـە

ڕاستی وەحی گیرا. لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەوە کراوە کە چەندین فریشتە کاریان ئەوەیە نەیزەکەکان دەگرنە ئەو شەیتانانەی دەیانەوێت بۆ گوێگرتن لە فریشتەکان بچنە ئاسمان. ئێستا ئەوەیشی کە (بانگهێشتکارانی ڕۆح) دەیکەن جیاوازی نییە لەوەی کە کاهینەکان دەیان کرد. تەنها ئەوە نەبێ کە، زۆربەی کاهینەکان ئەو زانستەی هەیان بوو هی ئەو جنۆکەیە بوو کە پەیوەندیان لەگەڵ دانابوو. ئەوانەی بانگەشەی بانگکردنی ڕۆحەکان دەکەن لەمانە بە ئاگا نین. بەم کەموکورییەوە، ترسی بارودۆخیان زیاتریش دەگوازنەوە. دەڵێن سوود لە ڕۆحەکان وەردەگرین، بەڵام ئەوەی دەلالی بکات بە وتە پڕوپووچەکانی شەیتانەوە، ئەوە بە هێندەی بوونی پێکەنیناوی باری ساحیرە هاوسەردەمەکان ناسۆرە.

شەیتان ناتوانێت لە خەونە ڕاستەکاندا خۆی بخاتە سەر شێوەی پێغەمبەری ئازیزمان، بەڵام لە دانیشتنی ئامادەخوازی ڕۆحەکاندا دەتوانێت ناوی ئەو بەکاربهێنێتو خۆی بە پێغەمبەر بناسێنێت. هەرچەندە ئەم جۆرە کارانە بنەمایەکیان نیە، بەڵام هەندێ جار کاریگەری سلبیان هەیە لەسەر ئەو مێشکە سادانەی کە لە دەوری ئەو کەسانە کۆدەبنەوە.

ئەو هەواڵانەی کە لەو جۆرە دانیشتنانەدا دەدرێن ڕەنگە هەندێکی ڕاست بن سەبارەت بە ڕابردوو، بەڵام سەبارەت بە داهاتوو هەرگیز ڕاست نین! چونکە داهاتوو غەیبە. لەگەڵ ئەوەشدا کە

غەیبە، تەنها بە ئیزنی خوای پەروەردگار کەسە ڕێکوپێکە مەزنەکانی ئیسلام دەتوانن پێشبینی هەندێکی بکەن. هەرچی شەیتانیشە، لەگەڵ هەواڵێکی ڕاستی ڕابردوودا نەوەد درۆ و دەلەسەش هەڵدەبەستێت، تا دەگات بە مەبەستەکەی.

ئایدن سەبارەت بە بابەتێکی دیکە پرسیاری کرد کە مرۆڤ لە ژیانی ڕۆژانەدا بیری لێ ناکاتەوە ئەویش بابەتی تناسخ بوو ... واتە ڕۆحی کەسێکی مردوو بچێتە لاشەیەکی ترەوە و، دووبارە بگەڕێتەوە بۆ ژیان.

کاک دۆغان بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە وەڵامی ئەم پرسیارەشی دایەوە:

– لە ڕاستیدا ئەم بیرۆکەیە زۆر کۆنە. سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ هیندی و میصریە کۆنەکان. مۆمیاکردنی لاشەی فیرعەونەکانی میصرو، ناشتنیشیان بەیەکەوە لەگەڵ کەل و پەلەکانیاندا بەهۆی ئەو باوەڕە پڕوپوچەوەیە کە گوایە ڕۆح پاش ئەوەی چووە ناو لاشە جیاوازەکانەوە دووبارە دێتەوە بۆ لاشە کۆنەکەی، فیرعەونیش هەڵدەستێت و ئەو کەل و پەلانە بەکاردەهێنێت کە لە تەنیشتی نێژراون! بەڵام لەڕاستیدا ڕۆحەکان هەرگیز بەڕێگای (تناسخ) لە لاشەیەکەوە ناچنە لاشەیەکی تر، ئەم بیرۆکەیە بێ بنەمایەو دەماودەم گواستراوەتەوە تا ئەمڕۆ.

لـه قورئـانی پـیرۆزو فـەرموودەکانی پێغەمبـەردا زۆر بـە ڕوونـی ئاماژە بەوەکراوە کە مرۆڤ لـەژیانی دونیـادا تاقیدەکرێتـەوەو، پـاش مردنیش ڕۆحـی مـرۆڤ لـەجیهانی بەرزەخـدا چـاوەڕوانی ڕۆژی دوایـی دەکـات کـە لێپرسـینەوە لەگـەڵ مرۆڤەکانـدا دەکرێـت و سـەرەنجام بەپێی کردەوەکانی بـەرەو بەهەشـت یـان دۆزەخ دەبرێـت. هەڵبـەت لەسەرەتادا ژمارەی مرۆڤەکان لەسەر زەوی زۆر کەم بووە. هـەروەك پەیامـە ئاسمانییـەکان و زانسـتە مرۆیی‌یـەکانیش ئاماژەیـان بـەم ڕاسـتییە کـردووە. جـا ئەگـەر کۆچـکردنی ڕۆحـەکان لەلاشـەیەکی کۆنەوە بۆ لاشەیەکی تازە پەسەند بکرێت، ئەوا ئەمڕۆ پێویست بـوو ملیاران مرۆڤ بێ ڕۆح بوونایە، چونکە ژمارەی مرۆڤ لە دونیادا لەچاو سەدەکانی پێشتر چەندەها جار زیادی کردووە.

دونیا شانۆی تاقیکردنەوەیـە، لـە لایـەك پێغەمبـەرەکانو، کتێبـە ئاسمانییـەکانو فریشـتەکان هـەن، لـە لاکـەی دیکـە شـەیتانەکانو، بێباوەڕان کە لە ئیمپراتۆریەتی شەیتاندا سەربازی دەکەن هەن.

لەم لایەیانـدا ئـەو کەسـانەی بـەهۆی ئیمـان و پەرستشـەوە، لـەو تەمەنـە کورتـەدا ئاسـوودەیی هـەتا هـەتایی بەدەسـتدەهێنن بەختەوەرن، لە لاکەی دیکە ئەوانەی بەهۆی یاخی بوون و کوفرەوە بـەرەو سـزای هەمیشـەیی هـەنگا و بـە هـەنگاو نزیـك دەبنـەوە. هەریەکەیان ئاڕاستەیەکی پێچەوانەیان هەیە.

ئەم گفتۆگۆیە زۆر بەسوود بوو بەجۆرێك نەمان دەویست وازی لێبهێنین، کۆتا پرسیاری ئەم گفتوگۆیە من پرسیم:

– لە هەرێمەکەمان بابەتێك هەیە پێی دەڵێن جادوو. بەشێکی خەڵکی گرنگییەکی زۆر بۆ ئەم بابەتە نیشان دەدەن، تەنانەت هەندێ لە مرۆڤە حاقدەکان دەیانەوێت لە ڕێگای جادووەوە ئاواتە خراپەکانیان بهێننە دی. جادوو چییە؟ ئایا شتێکی لەو جۆرە هەیە؟

کاك دۆغان کاتێ لە لایەك خزمەتی دەکردین بە هێنانی سینییە میوەوە، لە لایەکیش بە گرنگییەوە گوێی لە پرسیارەکە دەگرت وتی:

– با گرنگی بەو بابەتەش بدەین، سەبارەت بەو بابەتە سەلمێنراوی گرنگ هەن.

ئێمەش لەلایەك میوەمان دەخواردو، لەلایەکیش گوێمان بۆ ڕوونکردنەوەکانی کاك دۆغان دەگرت.

– جادوو زۆر بەشی هەیە. جۆرێکی بەخێرایی دەست و بە ئامێرەکانی فێڵ کردن دەکرێت. ئەو تەماشاکارەی هۆکارەکەی نازانێت بە بینینی ئەنجامەکە هەڵدەخەڵەتێت و شەیدای دەبێت.

هۆکاری ڕاستی جادوو زیاتر شاراوەیە. دۆزینەوە و ئاشکرابوونی کێشەیە. بە گشتی لە جنۆکەکان و شەیتانەکانەوە وەردەگیرێن. لەم جۆرەدا شێوازە جۆراوجۆرەکانی جادوو و نوشتە بەکاردەهێنرێن. ئەوانەی ئەم کارە دەکەن بوونەتە دیلی شەیتان. بەرامبەر بەمە

شـەيتانەکان يارمـەتيان دەدەن. کارەکانيـان مايـەی فيتنەنانـەوەو خراپەکارييـە. تـۆوی ڕق و قـين لـەناو دڵەکانـدا دەڕوێـنن و، هـەوڵ دەدەن پەيوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا تێك بدەن.

بەڵام لەڕوانگـەی ئـايينی پـيرۆزی ئيسـلامەوە جـادوو بنەمايـەکی ڕاستی نيەو، ئەرکی سەرشانی مرۆڤی موسوڵمان ئەوەيـە کـە هـەموو کـات پـەنابگرێت بـەخوای گـەورە لەشـەڕی جادووبازەکـان. هـەردوو سـورەتی (الفلـق) و (النـاس) قـەڵغانی موسـوڵمانن دژ بـە جـادوو. پێويستە لەژيانی ڕۆژانەماندا ئەو دوعايانـە بخـوێنين کـە پێغەمبـەری ئازيزمان خوێندوونی.

ڕاستە کە هەندێ لە مامۆستا بێباوەڕەکانتـان چـەند سـاڵێکە لـە زۆربـەی وانەکانـدا باسـی بێبـاوەڕی و نکوڵيکردنتـان بـۆ دەکـەن و گومانی زۆريان سەبارەت بە بنەماکانی ئيمـان بـۆ دروسـت کـردوون، بەڵام هيوادارم کە لەم گفتوگۆ چەند کاتژمێرييەدا تەمومژی زۆرێك لە گومانەکانتان ڕەوييبێتەوە.

کـاك دۆغـان تـا لای دەرگاکـە ئێمـەی بـەڕێ کـرد، يـەك بـە يـەك دەستی گوشين، بە هەر جۆرێك بێت بە حەزی يەکتر بينينەوە بەڕێی کردين.

چاوانی هەمووما ن گـەش بـوو، دڵـە خامۆشبووەکانيشـمان تـەواو ڕۆشن بوو و هەست بە جوڵەجوڵێك دەکرا.

بەتایبەتی ئایدنی هاوڕێمان لەگەڵ ئەوەی کۆمۆنیست و بێ بڕوا بوو، کاتێ کە تەوقەی لەگەڵ کاک دۆغان کرد وتەکانی زۆر دڵڕفێن بوون. وتی:

– زۆر خۆشحاڵ بووم بە ناسینت، بە ڕای من هێشتا لە سەرەتای ڕێگاکەداین، بەڵام گوێ بیستی زۆر ڕاستی گرنگ بووم لە ئێوەوە. ئەمانە زۆر کاریان لە من کرد. ئومێدەوارم کە لە هەر یەکتر بینینێکماندا لەگەڵ تۆدا ڕاڕایی و گومانەکانیشمان چارەسەر بن.

بە شادمانی و خۆشییەوە چووین بۆ قوتابخانە، وەك ئەوەی بڵێی تازە گەڕاوینەتەوە بۆ ژیان.

هەموو ئەو هاوڕێیانەی ئامادەی گفتوگۆکە بوون لە قوتابخانە دەستیانکرد بە باسکردنی ئەو بابەتانەی کە گوێ بیستی بووبوون و کەسانێکی زۆریان بێدارکردەوە.

ئیتر هەموو ڕۆژێکی شەممان و یەك شەممان سەردانی کاك دۆغانمان دەکرد، گوێمان لەو گفتوگۆیەی دەگرت کە لێی تێر نەدەبووین و، هاوکات سوودمان لە پەیامەکانی نوور وەردەگرت.

ئەم خزمەتە، خێرایی جوڵەی کۆمۆنیست و بیری بێ باوەڕی لە قوتابخانەکەماندا سست کرد.

بارودۆخی ڕابەری یەکەمی قوتابی قوتابخانەکە ئایدن، گۆڕانکارییەکی گەورەی هێنایەکایەوە. لەبەر ئەوەی کاریگەییەکی زۆری لەسەر قوتابییەکان هەبوو، بەبێ وەستان ڕاستییەکانی ئیمان

و قورئانی بۆ قوتابییەکان باس دەکردو، بووە هۆکاری ئەوەی کە زۆرێك لە قوتابییەکان دەست بکەن بە نوێژکردن و پەرستشەکان ئەنجامبدەن.

ئیتر لە پۆلدا ئەو مامۆستا بێ باوەڕانەی وانەیان دەوتەوە ئاسوودە نەبوون، وەڵام بۆ بیروڕا ماددیگەری و نکۆڵیکارانەکانیان هەبوو. ئەمەش مامۆستاکانی زۆر تووڕە دەکرد.

مامۆستایەکمان لە میانەی وانە وتنەوەدا دیسان گرنگی دەدا بە بیروڕا نکۆڵیکارییەکانی و زۆر دەیوتەوە. هاوڕێیەکیشمان ڕووبەڕووی بوویەوە .

مامۆستاکەشمان بە هاوارکردنەوە دەیوت:

– ئەو خودایەی پێی دەڵێن (الله)، ئێوەی خۆش ناوێت. ئەگەر خۆشی بویستنایە، خراپەکاران‌و، شەیتانەکانی بەدینەدەهێنا. بۆچی ئەمانەی بەدیهێناوە؟ لەبەرئەوەی ئێوە گومڕا بکەن.

بەڵێ، دەتوانرێت بپرسرێت ئایا ئەو شەیتانانەی کە مرۆڤەکان لە ڕێگای ڕاست لادەدەن بۆچی بەدیهێنراون؟ خوای پەروەردگار بە بەزەییە، میهرەبانە و بەندەی خۆش دەوێت، ئەگەر بەو جۆرەیە بۆچی ئەو شتە زیان بەخشانەی لەناو نەبردووەو هێشتا دەژیانژێنێت و ڕێگری لە مرۆڤ ناکات لە چوونی بۆ ڕێگای هەڵە؟

لە گفتوگۆیەکی تازەدا ئەو پرسیارەمان لە کاك دۆغان پرسی ئەویش وتی:

- وەڵامی ئەم پرسیارە لە کتێبەکەدا زۆر جوان ڕوونکراوەتەوە. با بیخوێنینەوە.

ئەو بەشەی پەیوەندی بە بابەتەکە هەبوو خێرا کردییەوە و خوێندییەوە، کاتێکیش دەیخوێندەوە ئەم ڕوونکردنەوە و نرخاندنە جوانەی بۆ دەکرد:

دەتوانیت بپرسیت بۆچی خوای پەروەردگار ئەو شەیتانەی بەدیهێناوە کە هەوڵ دەدات مرۆڤەکان فریوبدات و تووشی لادانیان بکات؟

شەیتان شەڕە، خراپە و پیسە. ئایا بەدیهێنانی شەیتانیش شەڕ و پیس نییە؟ بۆچی خوای پەروەردگار ڕێگە دەدات ئەم شەڕ و خراپە مرۆڤەکان بەرەو هەڵە ببەن؟

لەڕاستیدا بەدیهێنانی شەڕ وەك خودی شەڕ نیە، بەدیهێنانی ناشیرینش ناشیرین نییە. بەواتای ڕاستییەکەی ئەوەی شەڕ بێت، ئەنجامدانی شەڕە. ئەوەی تاوانیش بێت ئەنجامدانی تاوان و خراپەیە، چونکە خوای پەروەردگار وەك چۆن خێری بەدیهێناوە، شەڕیشی بەدیهێناوە. ئەوەی کاری پێدەکات و ئەنجامی دەدات مرۆڤە.

خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە بەندەکانی موحاسەبە دەکات کە شەڕو خراپەیان پەسەند کردووەو ئەنجامداوە، نەك لەبەرئەوەی کە شەڕو خراپە بوونیان هەیە.

بۆ نموونە با بیر لە باران بکەینەوە. وەك دەزانرێ باران ئەوەندە سوود و لایەنی جوانی نەژمێردراوی هەیە، بە جۆرێك کە ئەگەر باران نەبارێت ژیان بەردەوام نابێت، چونکە ئاو ژیانە و خوای پەروەردگار هەموو شتێکی لە ئاوەوە بەدیهێناوە.

باران نەبارێت نەبوونی و قات و قڕی و بێ ئاوی ژینگە تەسك دەکاتەوە و لەناوی دەبات. هەموومان دەزانین کە ساڵانە هەندێ لە وڵاتانی ئەفریقا بەهۆی وشکە ساڵییەوە لە قات و قڕیدا دەژین.

ئەمەندە سوودی باران و جوانییەکانی پەسەند دەکەین. ئینجا پێش باران یاخود دوای باران هەندێ کەس لەبەر بێ ڕێ و شوێنی و خەمساردییەوە ئەگەر بەهۆی بارانەوە توشی زیان ببن، بۆ نموونە ئەگەر تەڕببن و نەخۆش بکەون، ئەگەر لە سەربانەکانیانەوە ئاو بچۆڕێتە خوارەوە و ماڵەکانیان ئاو دای بپۆشێت، دەتوانن بڵێن ناردنی باران ڕەحمەت نییە، بارینی باران شەڕە؟ بێ گومان ناتوانن وا بڵێن، چونکە خۆیان بوونەتە هۆکار بۆ ئەو خراپییە، ئەو شەڕ و نەگبەتییە ناگەڕێتەوە بۆ بارینی بارانەکە، ئەگەر ڕێ و شوێنی بگرتایە بەر بارودۆخێکی بەم شێوەیەی بەسەردا نەدەهات. واتە یەکێك لافاو بچێتە ماڵەکەیەوە، ئەگەر هەڵسێت و بڵێت باران زیان بەخشە، هیچ کەس ناتوانێت بەو بڕیارەی پێنەکەنێت، پشکی ڕەوایی پێ بدات.

هەمان بیرکردنەوە سەبارەت بە ئاگریش هەر ڕاستە. ئاگر زۆر سوودی نەژمێردراوی هەیە. ئاگر بە تەواوی باش و جوانە، چونکە یەکێکە لە نیعمەتەکانی دەستەبەرکردنی بەردەوامی ژیان. هەر لەو نیشانەی کە لە چێشتخانەکاندا ئەنجام دەدرێن، تا دەگاتە دەستەبەرکردنی گەرم بوونەوە لەڕێگەی ئاگرەوە دێتەدی. ئەمڕۆ تەکنەلۆجیاو، پیشەسازی و بەرەوپێش چوونی ماددی هەمووی لە سایەی وزەی ئاگرەوە بەرەوپێش دەچن.

بەڵام ئەو کەسەی لە کاتی خۆیدا ڕێ و شوێنی پێویست ناگرێتەبەر یاخود ئەوەی خەمساردی نیشان دەدات، ئەگەر بەهۆی سووتانەوە هەندێ شتی لەدەست بدات، ئایا دەتوانێت بڵێت بەدیهێنانی ئاگر شەڕەو بوونی ئاگر زیان بەخشە؟

ئەوە مانای وایە بەدیهێنانی ئاگر شەڕ و خراپی نییە، تەنها و تەنها ئەو کەسە زیانی پێدەگات کە نازانێت ئاگر بەکاربهێنێت. ئەو کەسەی کە دەڵێت ئاگر خراپو زیان بەخشە، قسەکەی هیچ بنەمایەکی ڕاستی نییە. لەلایەکی ترەوە ئەگەر دوژمن پەلاماری وڵاتەکەمانی دا، ناچارین لەپێناو پاراستنی گیان و ماڵی هاوڵاتیان جەنگی لە دژ بەرپا بکەن، لەکاتێکدا کە بەرپابوونی جەنگ واتە هەندێ لەناو دەچن ژیانی خەڵکی دەشێوێت و خەڵکێکی زۆریش گیان لەدەست دەدەن.

دەرکــەوتنی ئــەم گیــان لەدەســت دان و لەناوچــوونانە شــەڕو نەگبەتییە، بەڵام ئەم جەنگە لە کۆتاییــدا خێـری گـەورە و ئـەنجامی جوان دەستەبەر دەکات. دین و نـامووس‌و هاوڵاتیـان لـە داگیرکـاری هێـزی سـەربازی دوژمـن ڕزگاریـان دەبێـت‌و جـارێکی دی نیشـتمان بنیـات دەنرێتــەوە، خـۆ بەپێچـەوانەوە ئەگـەر ئـەرکی پاراسـتن و بەرگری کردن لەوڵات نەگرینــە ئەسـتۆ ئـەوا هـەموو شـتێك لەدەسـت دەدەین.

با ئێستا بێینە سەر بابەتی بەدیهێنانی شەیتان: ئەو شەڕانەی لـە بوونەوەردا بوونیان هەیەو، بەڵاو ناڕەحەتیـەکان و بـەدیهێنانی شـتە زیــان بەخشــەکان شــەڕ و نەشــیاوی نــین. ئەمانــە لەکۆشــەی ئەنجامەکانــەوە مایــەی هاتنــە کایــەی خێــر و باشــەن. لــەم ڕوانگەیەشەوە بەدیهێنانی شەیتان شەڕ و خراپە نییە، چونکە خوای پەروەردگار بۆ مەبەستێکی زۆر گرنگ شەیتانی بەدیهێناوە.

مرۆڤەکان بە ناسینی شەیتان وەك دوژمن دەتـوانن ببنـە دۆسـتی خودای پەروەردگار، دەتوانن ببنــە خۆشەویسـترین بەنـدەی خـودا. دەتوانن بگەن بە بەهەشت و شادمانی هەتا هەتایی.

واتــە مــرۆڤ بــە دژایــەتیکردنی شــەیتان و ڕووبەڕووبوونــەوەی فریودانەکان دەچێتە نێو پێشبڕکێیەکی واتاییـەوەو، تێدەکۆشـێت و لـە کۆتاییــدا لـەڕووی ڕۆحیــەوە بــەرەوپێش دەچـێت‌و دەگـات بــە پلەیەکی بەرز. ئینجـا بـەم شـێوەیە لەبـەر ئـەوەی شـەیتان بووەتـە

هۆکار بۆ ئەنجامێك، کەواتە لەم ڕووەوە بەدیهێنانی ڕەگەزی شەیتان باشە.

کەواتە بەدیهێنانی شەیتانەکان بۆ ئەوە نییە کە مرۆڤەکان بەرەو ڕێگای هەڵە ڕابکێشێت. تەواو بە پێچەوانەوەیە، مرۆڤەکان لە ڕێگای شەیتان هەڵدێن و ڕوودەکەنە ڕێگای ڕاست. ئەوکاتە مرۆڤ سەرکەوتوو دەبێت لە تاقیکردنەوەی دونیادا و شیاوی دەستکەوتی بەهەشت دەبێت.

قوتابییەکانی قوتابخانە گرنگی زۆریان بە چالاکییەکانی ئەم ئیمان و قورئانە نیشان دەدا. زۆر چەپ و تەنانەت هەندێ ئاژاوە چی کە هێمنی قوتابخانەیان تێکدەدا گەڕانەوە و لەگەڵ قوتابییە ئیماندارەکاندا دەستیان کرد بە نوێژ کردن، هەندێ لە مامۆستاکانمان و چاودێرانی قوتابیەکان زۆر زۆر دڵخۆش بوون. ئیتر لە قوتابخانە بە کۆمەڵ نوێژمان دەکرد و بۆماوەیەك لە گفتوگۆکاندا ئامادە دەبووین.

هەندێ لە مامۆستاکان نەیانتوانی بەرگەی ئەم جووڵەیە بگرن و بە ئاشکرا هەڕەشەیان لێ دەکردین و دەستیان کرد بە دانانی یاسا.

ماوەیەك بارودۆخەکە گرژبوو، لایەنگرانی بیری ڕاست و چەپ لە قوتابخانە چوون بە گژ یەکدا.

ئەم بابەتەمان لە کاك دۆغان پرسی وتمان:"لە لایەك ڕاست، لەلاکەی دیکە چەپ. ئەمانە ڕووبەڕووبینەوە شەڕ دەکەن‌و لە یەکتری دەدەن‌و، خوێن دەڕێژن. ئایا ئێمە چی بکەین؟".

کاك دۆغان مرۆڤێکی دووربین بوو ولات و میللەتی خۆش دەویست، زۆر گرنگی بە هەڵسوکەوتی ئیجابی و هێمنانە دەدا.

لەم ڕووەوە ئامۆژگاری کردین و وتی:

– هیچ هێزێك ناتوانێت ڕێ لە بەندایەتی کردنمان، لە پاراستنی نیشتمان و میللەتەکەمان، لە پارێزگاری کردنی ئالا و کتێبە پیرۆزەکانمان بگرێت.

لە هەموو هەل و مەرجەکاندا ئێمە موسوڵمانین و هاونیشتمانی ئەم ولاتەین. ئینجا ئەو بارودۆخەی ئێستا تیایداین شەڕی برایەتییە. لەم حاڵەتەدا پێویستە هەڵسوکەوتتان بەم شێوەیە بێت:

هەرگیز مەچنە ناو شەڕەکەوە. ئەو لایەنانەی کە شەڕ دەکەن مانای وایە هاوسەنگییان لەدەستداوە. کاتێ کە شەڕ دەکرێت ناتوانرێت بڕیاری دروست بدرێت. ماف و یەکسانی نامێنێت. ئێوە چەندە کەسانی ڕاستیش بن کە تێلاتان بە دەستەوە گرت، کەسی بەرامبەر ڕاستییەکەی ئێوە نابینێت و بە چاوی دوژمنانەوە تەماشاتان دەکات. ئەگەر هەرەس بهێنن و، تەنانەت ئەگەر بشترسن دوژمنایەتیان بۆ ئێوە تەواو نابێت، بە پێچەوانەوە بۆ لاوازترین کاتتان دەگەڕێن.

ئێـوه لـه دەرەوەی شـەڕەکە بمێننـەوە. حکومـەت پـۆلیس و جەندرمەی هەیە. ئێوه ئـەم کـارە بـۆ ئـەوان جێبهێڵن. واتـە مـەڵێن ئێمـە دژی کۆمۆنیسـتەکان تێدەکۆشـین. واز لەوانـە بهێـنن بـۆ هێزەکانی بەندایەتی.

تێکۆشان بەرامبەر بێ دینی و کۆمۆنیستی بە شەڕو تـێڵاو خـوێن ڕشـتن نابێـت، بـەڵکو بـەوە دەبێـت کـە ببینـە باشـترین نموونـە بـۆ ئاینەکەمان و بەجوانی ڕەفتارو مامەڵە لەگەڵ کەسانی دەوروبەرماندا بکـەین . هـیچ خـەم مـەخۆن ئەمانـە تـەواو دەبێـت، بـێ بڕوایـی و کۆمۆنیستی ڕووبەڕووی مێـژوو دەبنـەوە. بیروڕاکـانی بـەدیعوززەمان (سەعیدی نوورسیش) لەم ئاڕاستەیەدایە.

کـاك دۆغـان ڕێگـای ڕاسـتی نیشـانداین و ژیانمـانی لـە مەترسـی پاراسـت. نەچـووینە شـەڕەکەوە، گیـانی کـەسمان نەخسـتە مەترسـییەوەو زیانمـان بـە مـاڵی کـەس نەگەیانـد. هـەموو کـات یارمەتیدەری خەڵك و فەرمانبەرەکانی حکومەت بووین. ڕاستییەکەی پێویستیش بوو یارمەتی دەریان بین.

ئێستا بیردەکەمەوە ئەگـەر بـەهۆی شـەڕی برایەتیـەوە خواسـتی گەردەلوولی بێ بڕوایـی و جووڵـەی کۆمۆنیسـتی و ئاژاوەچـێتی خێـرا سـەری بگرتایـە، ئەگـەر دۆغـان بینێـر و ئـەو کەسـانەی وەك ئـەو بیردەکەنەوە یارمەتیان نەدایانایە ئەوا ئێمەش سنوورمان دەبەزانـدو

دەبووینــە کەســانی دوژمنــی دیــن و وڵات، یــان لــە بەندیخانەکانــدا دەبووین، یان بە فیشەکێکی وێڵ دەڕۆیشتین و تیادەچووین.

بەهەرحاڵ پێویست بـوو شـێوازێك بـۆ چاکسـازی ئـەو کەسـانەی ملیــان بــە دیــنو حکومــەت و ڕێســا نــەدەدا پــەیڕەوبکرێت، ئــەو کەسانەیشــی کــە خزمــەتیان کــردووە پێویســت بــوو خــەڵات بکــرێن، چونکە ئێمە ژیانمان قەرزداری ئەوان بوو.

***

خاوەنی ئەم یادەوەرییەش مامۆستایەك بـوو بـە نـاوی ڕەمـەزان دەمیر .

هەرکەسـێك ئـەم مامۆسـتا بـەڕێزەی ناسیبێت و لەگـەڵی ژیابێـت شایەتی ئەوە دەدات کـە چـەندە کەسـێکی بـە جـەرگو ئـازا و چـاو نەترس بوو.

منـیش شـاهیدی بەشـێکی ئـەو ڕووداوانـە بـووم کـە باسـی کـرد، ئامادەی بەشێکی ڕووداوەکانیش بووم.

ڕەمەزان دەمیر کاتێ لە پارێزگای (کاهتی ئادییەمان) مامۆستایی دەکرد، کۆچی دوایی کرد .

ڕەمەزان دەمیر خۆشەویستی نیشتمان و میللەت بـوو، بـە سـۆزی پــڕ ئیمــان و قورئــان لــە ژیــانی مامۆســتایەتیدا بــێ کــەموکورتی قوتابییەکانی پێگەیاند. وەك مرۆڤێکی نموونەیی دەژیا.

پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات سەردانیم کرد. شەو تا بەیانی باسی بیرەوەرییەکانمان کرد. بەیەکەوە گریاین و هەڵسەنگاندنمان بۆ ژیان کرد .

درەنگ هەواڵی کۆچی دوایم بیست. ڕاستە ئەو دۆستان و خۆشەویستانی دونیای بەجێهێشت، بەڵام مردنیشی وەك ژیانی دۆستەکانی تووشی سەرسوڕمان کرد و ڕاپێچی نێو پەند و سەرسوڕمانی کردن، چونکە مرۆڤێکی ئاسایی نەبوو. ئەو خۆشەویستی خودا و بەندایەتی و سۆزی نیشتمانەی کە لە دڵیدا بوو، ڕەمەزان دەمیری لە مرۆڤەکانی دیکە جیادەکردەوە.

پێش وەفات کردنی بە هاوڕێیەکمی وتبوو:

– ئیتر ئەم شوێنانە تەنگە بۆم، پێویستم بە شوێنێکی فراوانتر هەیە.

هاوڕێ نزیکەکەشی پرسی بووی:

– خێرە، یاخود ئامادەکاری بۆ کۆچ کردن بۆ شوێنێکی تر دەکەیت؟

– بەڵێ، کۆچ دەکەم. کەسانێك هەن بانگم دەکەن. لەم نزیکانەدا دەڕۆم.

هاوڕێکەشی وتبووی:

– دەچیت بۆ کام پارێزگایە؟

کاك ڕەمەزانیش: وەڵامی دابووەوە وتبووی: "خودا دەزانێ".

هاوڕێکەی نەیتوانی بوو لە مەبەستی کاک ڕەمەزان تێبگات .

ڕەمەزان دەمیر ئەو شەوە تا بەیانی قورئان و دوعای جەوشەنی خوێندبوو، لە خودا پاڕابووەوە.

نوێژی بەیانیشی کردبوو، بەبێ خەو ڕۆژی کردبۆوە. چووبووە بەردەمی ماڵەکەی، قاچی لە دیوارێکی نزم خلیسکابوو، کەوتبوو.

ئەو ڕەمەزان دەمیرەی کە ماڵ ئاوایی لە هەموو کەسێك کردبوو، خۆی بۆ مردن ئامادە کردبوو، کۆچی دوایی کرد.

ئیتر بۆخۆی ڕزگاری بووبوو لەو دونیا زۆر بێزارکەرە، گەیشتبوو بەو زاتەی کە خۆیی بانگی کردبوو و پەنای بردبووە بەر باوەشە میهرەبانییەکەی.

کەسێك کە دڵ و دەروونی پڕبوو لە ئیمان، ئایا دەیتوانی زیان بەخش بووایە بۆ نیشتمان و کۆمەڵگاکەی؟ ئایا دەیتوانی ماف و یەکسانی پشتگوێ بخات لەو کارەی کە دەیکرد؟ ئایا دەیتوانی خەمساری لە پەروەردەی قوتابییەکانیدا نیشان بدات؟

ڕەمەزان دەمیر هەم ژیانی، هەمیش مردنەکەی پڕە لە وانە.

خوای پەروەردگار بەهەشت بکاتە مەنزڵی.

خالید ئێرتوغروڵ

# له پێشدا قەرزی خودا و میللەت

## بدەرەوە



لـە شارۆچـکەیەکی دڵگـیری ئەنادۆڵـداو، لـەنێو خێزانێکـی کـەم دەرامەتدا چاوەکانم بە دونیا هەڵهێنا.

بەهۆی بێ باوکی و هەژارییەوە ئازارگەلێکی زۆرم چەشت.

ڕۆژانی منداڵیم پڕ بوو لـە مـەحرومی و دەستەوسـانی و، شکسـت هێنان لە گەیشتن بە خواست و ئارەزووەکان.

بوونە خاوەنی جل و بەرگ و جانتـای تـازە بـۆ مـن تـەنها خـەیاڵ بوو. کاتێك هاوڕێکانم دەبینی پۆشاکی نوێیان لەبەردەکردو کەلوپەلی تازەیـان بـەکاردەهێنا بـەخیلیم پـێ دەبـردن و بـە تاسـەوە سـەیرم دەکردن. هەندێ جاریش دەچوومە پەنایەکەوە دەگریـامو، دەمـوت: "بۆچی ئەوان هەیانە و من نیمە".

من و دایکم و کاکم لە خانوویەکی گڵدا دەژیـاین، کـە لەیـەك ژوور پێکهاتبوو.

بەبێ باوك گەورە بووین، دایكم بەردەوام هەوڵی دەداو تێدەكۆشا بۆ ئەوەی چاودێریمان بكات و بـژێوی ژیانمـان بـۆ پەیـدا بكـات، زۆر بەوەفاو میهرەبان بوو، هەمیشە لە خەمی ئێمەدابوو، دڵـی نـەدەهات تێر سكی نان بخوات، نانی دەرخواردی ئێمە ئێمە دەدا (دەیـوت: بـا منداڵەكانم تێربن). خۆی بە برسێتی ڕۆژی دەكـردەوە، دایكێكـی زۆر نەفس بەرزبوو، لەپێناو ئێمەدا ژیانی خۆی كردبووە قوربانی.

لـەماڵەكەمانـدا تـەنها حەسـیرێكمان هـەبوو بـۆ ڕاخسـتن كـە لـە قامیش دروستكرابوو. زۆرپامان نەبوو، لەتاو سـەرما دەچـووینە ژێـر جێگاوە، وانەكانمان لەسەر جێگەی خەوتن جێبەجێ دەكرد.

ئەگـەر كتێـب و دەفتـەری كۆنمـان هەبوایـە، ئـەوا زۆر دڵخـۆش دەبووم. بۆ ئەوەی دەفتەرەكانم زوو تەواو نەبن بەبچووكی لەسـەرم دەنووسـین. زۆر كـاتیش نووسـینەكانم دەكوژانـدەوە و سـەرلەنوێ بەكارم دەهێنانەوە.

لـە نەبوونیـەكی سـەختدا دەژیـایین، تـەواو هەراسـان بـووین، بـۆ ئەوەی تەواو لـە دەسـت دەرنەچـین و نەبینـە كەسـێكی یـاخی بـوو، هـــەموو ڕۆژێ گوێمـــان لـــە ئامۆژگـــاری و ئاگادارییـــەكانی دایكـــی خوالێخۆشبوومان دەگرت. دەیوت:

– خەفـەت مـەخۆن ڕۆڵـەكانم. خـوای پـەروەردگار بەدەسـەڵاتە بەسـەر هـەموو شـتێكدا. حـاڵی هـەمووان دەبینێـت، ئـارام بگـرن، تێبكۆشن، هەرچۆنێك بێت لەم ناڕەحەتیە ڕزگارمان دەبێت.

دایکم دەیویست هەر لە منداڵییەوە دڵمان بە خوداو، ڕۆژی دوایی، قورئان و ئیسلامییەتی شاد بکات. هەوڵی دەدا ئێمە فێری خۆڕاگری بکات، بۆ ئەوەی بەرگەی ناڕەحەتیەکانی ژیان بگرین.

دەرچووم بۆ پۆلی دووەمی سەرەتایی، بەردەوام لە هەموو ناڕەحەتیەکدا ئەو برا گەورەیەم یارمەتی دەدام، هەرچەندە ئەویش لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بوو.

ڕۆژێک بەفرێکی زۆر باری لە ماڵەوە بەڕێ کەوتین بەرەو قوتابخانە، بە هەزار ناڕەحەتی گەیشتینە نزیک قوتابخانە، پێڵاوەکانمان دڕابوو، لەسەرمایا هەڵدەلەرزین.

من هەموو لاشەم سڕ بووبوو، هەستم بە دەست و پێکانم نەدەکرد. برا گەورەکەشم زۆر سەرمای بوو، هەردووکیشمان لە بەفرەکەدا چەقیبووین‌و دەگریاین. مامۆستایەکمان لە پەنجەرەی پۆلەکەوە ئێمەی بینی بە ڕاکردن هات بۆ لامان. هەردووکمانی لە باوەش گرت و لە بەفرەکە دەری هێناین و بردینی بۆ پۆلەکە. پێڵاوە دڕاوەکانمان لە بەفرەکەدا چەقیبوون بەهۆی بۆرانی بەفرەکەشەوە لە نێویدا بەجێما. گۆرەویمان لە پێدا نەبوو. لە ژێر بەروانکە دڕاوەکەمەوە فانیلەیەکم لەبەردابوو، هەروەها پانتۆڵێکم لەپێدا بوو کە پینە لەسەر پینەی پێوە بوو. مامۆستا ئێمەی لەبەردەم زۆپای پۆلەکەدا دانیشاند. لەلایەک زۆپاکەی گڕ دەداو

فرمێسکی چاوەکانمانی دەسڕی، لەلایەکی دیکەشەوە بۆخۆی بەبێ دەنگی دەگریا.

بەگەرمی زۆپاکە دەست و پێمان دەستی کرد بە خاوبوونەوە. بە وتنی: "ئای ڕۆڵەکانم"، ئێمەی لە باوەش گرت. بۆ ئەوەی ئەو فرمێسکانە نیشان نەدات کە بە ڕووە گەش و نوورانییەکەیدا دەتکان، زوو زوو ڕووی بۆ دواوە وەردەگێڕا و دەموچاوی دەسڕی. وتی:

– خەفەت مەخۆن ڕۆڵەکانم پەتی دونیا بە دەست خوداوەیە. ئەو هەرگیز زوڵم لە بەندەکەکانی ناکات. ئارام بگرن، ئەمەی دەیچەژن لە داهاتوودا دەبێتە ئاسوودەیی و بەختەوەری ژیانتان.

دووەم ڕۆژ مامۆستاکەمان گۆرەوی و چاکەتی بۆ کڕی بووین.

لە ژیانمدا ئەوە یەکەم جارم بوو جلی تازە لەبەر بکەم. وامدەزانی هەموو دونیا هی منە، لە خۆشیدا دەفڕیم.

دایکی خوالێخۆشبووم دوعای زۆری بۆ مامۆستاکەمان کرد. بەمەبەستی سوپاس کردنی لەگەڵ دایکمدا سەردانمان کرد. دایکی خوالێخۆشبووم وتی:

– مامۆستای بەڕێز خودا لێت ڕازی بێت. لە ڕۆژگاری تەنگانەدا بەفریای منداڵەکانم گەیشتوویت، بەڵام ئێمە ناتوانین شتی بێ بەرامبەر قبووڵ بکەین. پارەی ئەمانە چەند لیرە بێت من لە بەهاردا دەچم بۆ ئیشی ڕۆژانەو دەیدەمەوە.

وتی:

– چۆن شتی وا دەبێت دادە، ئەمڕۆ منداڵەکانی ئێوە پێویستیان بەمانە هەیە، لەوانەیە سبەینێش منداڵەکانی من پێویستیان پێی بێت. من لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە یارمەتی کەسانی موحتاج دەدەم، سا بەڵکو سبەینێش خێرخوازێك یارمەتی منداڵەکانی من بدات. ئارام بە تکایە من لەم کارە خێرە بێ بەش مەکە.

ئەم هەڵوێستانە چەندە پەند ئامێزو سەرسوڕهێنەرن.

دایکم بەوە دەرسمان دادەدا کە بەبێ بەرامبەر هیچ شتێك لەکەس قبوول نەکەین، مامۆستاکەشمان تامەزۆریە کاری خێر ئەنجام بدات.

دوای ساڵێك مامۆستاکەم فەرمانی گواستنەوەی دەرچوو و ڕۆیشت. ئیتر ئەو کەسە نەما کە هەموو ساتێك پشتگیری دەکردین و ڕاستییەکانی نیشان دەداین.

بەڵام ئەو ئومێد و خۆڕاگرییەی کە مامۆستاکەم پێی بەخشین، بوو بە خاڵی پشت پێ بەستن و بەرەنگاربوونەوە لەژیانماندا. دەیوت:

– زۆر هەوڵ بدەن ڕۆڵەکانم، پیرۆزترین و بە نرخترین کار کۆشش کردن و خوێندنە. بێگومان خوای پەروەردگار کۆمەکتان دەکات و دەتانگەیەنێت بە ئامانج، نیگەران مەبن و بڵێن هەژارو بێ کەسین، لە پشت بێ کەسیو هەژارییەوە بەزەیی بێ کۆتایی خودا هەیە.

هەمیشە متمانەتان بەو زاتە هەبێت. ئەو خاوەنی بەزەییەکی لەئەندازە بەدەرە کە لە ئێوە باشتر بیر لە خۆتان دەکاتەوە و دەتان پارێزێت. با گەورەترین دۆستتان خودا بێت، چونکە ئەگەر ئەو بکەنە دۆستی خۆتان، ئەویش هەموو کەس دەکاتە دۆست و یارمەتیدەرتان، کۆسپەکانی بەردەمتان لادەبات. هەرگیز سازش مەکەن بۆ حەرام و کاری حەرام، وەك کرمی ناو درەخت ڕاستیی‌و شەرەف و نرخی ژیانتان لەنێو دەبات. لە کۆمەڵگادا سوك و ڕیسواتان دەکات.

مامۆستاکەمان کەسێکی زۆر بەڕێز بوو. لە هەموو وانەیەکدا زوو زوو قوتابییەکانی بەم ئامۆژگارییانە وریا دەکردەوە، یاسا گرنگەکانی ژیانی پێشکەش دەکردن.

قوتابخانەمان تەواو کردبوو. خوای پەروەردگار دوعاکانی دایکی خوالێخۆشبووم کە لە ناخەوە دەیکردن، ئاوات و خواستەکانی مامۆستاکەمانی قبووڵ کردو پیشەی مامۆستایی کردە قسمەتم.

نمرەیەکی بەرزم بەدەستهێنا. ئەو ساڵەش ئەوانەی کە نمرەی بەرزیان بەدەستهێنابوو لەلایەن حکومەتەوە بانگهێشت کرابوون بۆ ئەنکەرە بۆئەوەی خەڵات بکرێن، کەچووین بە جۆرەها دیاری ڕێزیان لێناین. دواتر لەگەشتێکدا بردیانین بۆ بینینی شوێنە مێژوویی و گەشتیارییەکان.

که چووین بۆ ئیزمیر له باخێکدا خەریکی پیاسه کردن بووین، ئەو مامۆستایەی که سەرپەرشتیارمان بوو، منی نارد بۆ دوکانێکی نزیك بۆ جگەره کڕین. چووم جگەرەم داواکردو کڕیم. کاتێ دووکاندارەکه پارەکەی دەژمارد، دەنگی سەرنجمی ڕاکێشا. ئەو دەنگه بۆ من نامۆ نەبوو، که سەرنجم دا سەیرێکی ڕووخساریم کرد، چاویلکه له چاو، قژی سپی بوو، پیاوێکی بەڕێزی دەموچاو نوورانی بوو، که هەستی کرد من به سەرنجەوه لێی ورد دەبمەوه وتی:

– ئەوه خێره! من دەناسیت؟

کەمێك بەشەرمەوه وتم:

– دەنگت سەرنجی ڕاکێشام، وا هەست دەکەم.

که چاوەکانی بڕیه چاوم، به میهرەبانییەوه وتی:

– خەڵکی کوێیت؟ ئادەی تۆ له پێشدا بیڵێ.

ناوی قەزاو شارۆچکەکانم پێ وت.

به وتنی:"ئای خوایه گیان"، باوەشی کردەوه.

– کەواته تۆ خەڵکی ئەو شوێنەیت که من مامۆستایەتیم تیادا کردووه، وا نییه؟

پەنا به تۆ خوایه گیان، له یەك ساتدا تەزوویەك هات بەلاشەمدا.

١٢ ساڵ بوو یەکترمان نەبینیبوو، مامۆستاکەم تەواو پیربووبوو بەهۆی چاویلکەو قژه سپیەکەیەوه نەمتوانی بیناسمەوه. پرسیم:

– تۆ ناوت سەعیده؟

بە هەمان گەرم و گوڕییەوە وتی:

- بەڵێ.

تەنها توانیم بڵێم:" وەی مامۆستا گیان"... نوشتامەوە دەستەکانی ماچ بکەم، بە دەنگێکی گەرم و گوڕی سەرسوڕهێنەر و پڕ سۆزەوە تەنها توانیم بڵێم:

- من خالیدم...

دەستمان کردە ملی یەکترو، دەستمان کرد بە گریان.

- تۆ خالیدیت ها... ئاخریەکەی تۆ گەورە بوویت و ئەم ڕۆژەیشم بینی کە بوویتە مامۆستا. بەڕاستی زۆر خۆشحاڵم کە نمرەی بەرزت بەدەستهێناوە، وادەزانم کوڕەکەی خۆم ئەو پلە بەرزەی بەدەستهێناوە.

منیش لە حزووری ئەو مامۆستا وەفادارەی کە زۆر یارمەتیدامو بە دڵ و لە ناخەوە زۆر دوعای بۆ دەکردم، لەوەش گرنگتر فێری سەربەرزی و بەڕێزی کردم، قەرزداری چی نەبووم؟!

کە وتم:"مامۆستا چۆن قەرزەکەی ئێوە بدەمەوە"، یەکسەر بە ڕاست وەری گرت. وتی:

- نەخێر خالید گیان، هەرگیز قەرزداری من نیت، بەڵام هەموومان قەرزداری قوتابییەکانو، کۆمەڵگاو، ئەم نیشتمانەو، لە هەموو ئەمانەش گرنگتر زۆر قەرزداری خوای پەروەردگارین. ئەگەر

ئەو قەرزانە بدەیتەوە، ئەوا گەردنت ئازاد بێت، ئەگینا ئەگەر ئەوانە نەدەیتەوە با منیش گەردنتم ئازاد کردبێت، هیچ کەڵکی نابێت؟

مامۆستاکەمان زۆر ڕاستی وت، هەرگیز ناتوانم ئەم ڕاستییە لە بیر بکەم، تەنانەت پێویستە هیچ مامۆستاو هاونیشتمانییەکیش ئەم ڕاستیانە لەبیر نەکات.

خوای گەورە، هەزاران قوتابی کردە قسمەتی منیش لە کاتێکدا کە شایستەشی نەبووم. ئیشەڵا هەوڵ دەدەم ببمە کەسێکی شایستە بۆ خزمەتی کۆمەڵگاو نیشتمانەکەم و هەم بۆ مامۆستاکەم، ئیتر ئەو کاتە مافی گەردن ئازادی مامۆستاکەم بەدەست دێنم.

خوایە گیان! لە نیعمەتەکانت بێبەشمان نەکەیت.

خالید ئێرتوغروڵ

# پیاوکوژێکی دڵ ڕەق

# چۆن گریا ؟

لـە بەندیخانـەی قەیسـەر هـەموو کـەس دەربـارەی ئـەو قسـەی دەکرد.

بە نازناوی (ئـادەمیزادی درنـدە) بـەناوبانگ بـوو، ئـەو تاوانبـارە کۆمـەڵێك تـاوانی زۆر قورسـی ئەنجامـدابوو، لەبەرئـەوە حـوکمی زیندانیکردنی هەمیشەیی بەسەردا درابوو.

چەندین کەسی کوشتبوو.. ماڵی چەندەها کەسی وێران کردبـوو.. ئەو تەنها پیاوکوژێکی دڵ ڕەق نەبوو لە هـەمان کاتـدا کەسـێکی بـێ بڕوا بوو.

لەو ڕۆژەوەی کە باوەڕی بە خودا نەمابوو وەك درندەی لێهاتبوو. ئەوەی دەهاتە ڕێی ڕای دەماڵی.

کەسێك کە باوەڕی بە خوداو ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوە نەبێت لە کێ دەترسێت و شەرم لە کێ دەکات؟ خۆی لـە خۆیـدا بـە درێـژای

تەمەنی لە بەندیخانەدا حوکم درابوو، ئیتر شتێك نەمابوو کە لە دەستی بدات. لەبەرئەوە دڵڕەقانە و بێ شەرمانە هەموو کارێکی نەشیاوی ئەنجام دەدا.

ئەو بووبوو بە دێوەزمەی نێو بەندیخانەکە.

باڵا بەرزو، قەڵەو، برۆکانی بەسەر چاوەکانیدا شۆڕبووبوونەوە، ڕووخسارێکی درێژ و ڕووشاوی هەبوو، کاتێ تەماشای دەکرد دووچاوی ترسناك زەق دەبوونەوە... ئەم پیاوە دڵڕەقە کە بە زیندانی هەمیشەیی حوکم درابوو، دەیویست بە پەلاماردانی کەسانی دەوروبەری سەری خۆی سووك بکاتو لە ملهوڕی و کێشەکانی ناخی ڕزگاری بێت، وای دەزانی بە لێدان و خوێنڕشتن ئاسوودە دەبێت.

هەر کە دەردەکەوت هەمووان لەسەر ڕێگاکەی لادەچوونو بەڕێزەوە لە بەردەمیدا دەچەمینەوە. ئایا دەیانتوانی بە زەردەخەنەوە سڵاویان لێ نەکردایە، یان نەیانوتایە:"ئەمرێکت هەیە بەکم؟!"

فەرمانبەرەکانی بەندیخانە لە ئاژاوەگێڕییەکانی ئادەمیزادە دڕندەکە بێزاربووبوون. بۆ ئەوەی دەنگی لێوە نەیەت و هۆکارێك نەدۆزێتەوە پەلاماری ڕاست و چەپ بدات ئەوەی لە دەستیان دەهات دەیان کرد. دەیان وت با ئاسایشی بەندیخانەکە تێکنەچێت، هەموو داخوازییەکیان بۆ جێبەجێ دەکرد .

کارگێڕی بەندیخانەکە لە ڕووداو و ئاژاوەکانی ڕۆژانەی بێزار بووبوو، بۆ بێدەنگ کردنی ئەرکی بەڕێوەبردنی حانووتەکەی پێ سپاردبوو، بەڵام هیچ بەندکراوێك لە ترساندا نەیدەتوانی بچێتە حانووتەکەوە شت بکڕێت، ئەگەر یەکێکیش بچوایە، نەیدەوێرا داوای باقی پارەکەی بکاتەوە.

(ئادەمیزادە دڕندەکە) لە ساڵی ١٩٧١ دا لە بەندیخانەی قەیسەری لە ترساندن و ئازاردانی بەندکراوەکان بەردەوامبوو. هەر لەو ساڵەدا دۆغان بینێرو چەند هاوڕێیەکی بۆ بەندیخانەی قەیسەری برابوون، بەتۆمەتی ئەوەی ئێوارەیەك لە ماڵێك کۆبووبوونەوە و تەفسیری قورئانیان خوێندبوو.

لەو ساڵانەدا خەڵکی بەهۆی پابەندبوونیان بە نەریتە ئاینییەکانەوە ڕاپێچی بەندیخانە دەکران، هەموو ئەو کەسە نیشتمان پەروەرو موسوڵمانانە لەگەڵ خەڵکانێکی دزو پیاوکوژدا پێکەوە بەند دەکران.

ئادەمیزادە دڕەندەکە کە ناوە ڕاستەقینەکەی مستەفا بوو، لەگەڵ دۆغان بینێردا لە بەندیخانە لەڕووداوێکی زۆر سەیردا ڕووبەڕووی یەکتر بووبوونەوە.

ڕۆژێك کاك دۆغان بینێر خۆی ڕاستی ئەو ڕووداوەی بۆ گێڕامەوەو وتی:

– بەندکراوەکانی بەندیخانەکە بە هاتنی ئێمە زۆر سەرسامبوون، بە جۆرێك عەقڵیان نەیدەبڕی کە کۆمەڵە کەسانێك لەبەر خوێندنی تەفسیری قورئان و ژیانی ئیمانی بخرێنە بەندیخانەوە، لەجێگایەکدا بەندبکرێن کە دزو پیاوکوژو تێکدەرانی ئاسایشی کۆمەڵگای تیادا بەند دەکران.

لە سەرەتادا بڕوایان نەکرد کە تاوانەکەی ئێمە تەنها (خوێندنی تەفسیری قورئان) بێت. وتیان: "بە هەر شێوەیەك بێت ئێوە تاوانێکی تریشتان هەیە"، بەڵام دواتر کە ئێمەیان لە نزیکەوە ناسی لە ڕاستییەکە تێگەیشتن.

هاوڕێکانم کەسانی دیندارو سەر ڕاست و پاکوخاوێن بوون. ڕاستییەکەی کێ لە کەسێکی موسوڵمانەوە زیانی پێگەیشتووە؟ بەم هۆیەشەوە بەندکراوەکان لەماوەیەکی کورتدا ئێمەیان لە ئامێز گرت، ڕێزێکی زۆریان لێ گرتین.

لە قاوشەکاندا گفتوگۆی ئایینی دەکرا، پەیامەکانی نوور دەخوێنران، بابەتەکانی باوەڕبوون بە خوای پەروەردگارو، ڕۆژی دوایی و، لێپرسینەوە و ئامانجی مرۆڤ باسیان لێوە دەکرا، باس لە ئەنجامی خووە زیان بەخشەکان دەکرا.

پاش ماوەیەکی کورت لە قاوشەکاندا دەستمان کرد بە ئەنجامدانی نوێژی بە کۆمەڵ و دەرسی قورئانمان بە بەندکراوەکان دەوتەوە.

بەنـدكراوەكان تـا ئێـوارە سـەبارەت بـە بابەتـە ئیمانیـەكان پرسـیاریان دەكـردو ئێمـەش بـە خوێندنـەوەی تەفسـیری قورئـانیی (پەیامەكانی نوور) وەڵاممان دەدانەوە. بەنـدكراوەكان دوای ئـەوەی گومانـەكانیان دەڕەوینـەوە، هـەوڵیان دەدا ئەركـەكانی بەندایـەتی بەجێبهێنن.

ئێمە لەلایەك سزا یەك مانگییەكەمان لەگەڵ بەندكراوەكاندا وەكـو ڕۆژانی قوتابخانە دەگوزەراند، لەلایەكی دیكەشـەوە گوێبیسـتی ئـەو نەگبەتییانە دەبووین كە ئادەمیزادە دڕندەكە دەیكـردن. ئـەو تـەنها ئاغای بەندیخانەكە نەبوو، بەڵكو بەڵای بەندیخانەكەش بوو.

بەڵام بـەجۆرێك چارەنووسـی ڕووبەڕووبوونـەوە نـەبوو. لەمیانـەی هەموو گفتوگۆكاندا بەندكراوەكان دەیانوت:

– خۆزگە (ئادەمیزادە دڕندەكەش) گوێی لـەم بابەتـە ئیمانییانـە بگرتایەو ئیمانی بهێنایەو بەهۆش خۆیدا بهاتایەوە.

ئێمەش بەتەواوی خەفەتمان بـەم پیـاوەوە دەخـوارد، لـە هـەموو نوێژێكماندا لەخوا دەپاڕاینەوە ڕەحمی پێ بكات و بگەڕێتەوە.

لەو ڕۆژانەدا پێویست بوو داواكارییەك بۆ پارێزەرەكەمان بنووسـم بۆ كڕینی كاغـەز چـووم بـۆ حانووتەكـە. (ئـادەمیزادە دڕنـدە)كـەش حانووتەكەی بەڕێوە دەبرد. ڕاستییەكەی بە ترسـەوە كـەمێكیش بـە دوعا خوێندنەوە ڕۆیشتم بۆ حانووتەكە.

تا بڵێی بە دەنگێكی گەرم و لە ناخەوە وتم:

- بەڕێز مستەفا، دەتوانیت کاغەزی بێ خەتم بدەیتێ.

ئەو چاوە زلانەی بۆ لای من وەرگێڕا. بۆ ماوەیەك بە شێوازێکی ڕەق و مانادار سەیری کردم. پیاوێکی ترسناكو بەهێز بوو.

بە دەنگێکی بەرز وتی:

- کاغەزت بۆ چییە؟

وتم: ئێمە تازە هاتووینەتە بەندیخانەکەوە و نامەیەك بۆ پارێزەرەکەمان دەنووسین.

وتی: هههم. واتا ئێوە ئەوانەن؟

پرسیم: ئەوانە کێن بەڕێزم؟

- ئەو کۆمەڵە ئیسلامییە...

کەمێك وەستا. دووبارە بە دەنگێکی ڕەق بەردەوامی بە قسەکانی دا:

- هێی کوڕە ئێوە کێن؟ چیتان لەم حکومەتە دەوێت؟

- ئێمە شتێکمان نییە لە حکومەتی داوا بکەین. ئەوانەی خودا دەناسن بۆ دینەکەیان دەژینو ئەرکی بەندایەتییان جێبەجێ دەکەن، ئایا دەتوانن چی لە حکومەت بخوازن؟! هەموو موسوڵمانێك بە ئەرکی دەزانێت کە هاونیشتمانێکی ڕاستگۆ بێت بۆ حکومەت و وڵاتەکەی بپارێزێت، ئەمە ئەرکێکی بەندایەتییە.

- باشە بۆچی ئێوەیان دەستگیر کردووە و خستویاننەتە بەندیخانەوە؟

– لەبەرئەوەی هەندێ دوژمنی دین و خەڵکانی ناحەز دەیانەوێت حکومەت ڕووبەڕووی موسوڵمانان بکەنەوە و ئارامی بشێوێنن.

– باشە ئامانجی ئێوە چییە؟ بۆچی تەفسیری قورئان دەخوێننەوە؟ بۆچی کەسانی تر دەستگیر ناکەن تەنها ئێوەیان گرتووە و بەندیان کردوون؟

دیسان بە پێکەنینەوە و بەشێوازێکی هێمنانە دەستم کردە ناو گیرفانمەوە، پەیامی (بەری درەختی ئیمان)م دەرهێنا. وتم:

– تەماشا بکە بەڕێزم. با پێکەوە بە خوێندنەوەی بەشێك لەم کتێبە ئەوە بسەلمێنین کە ئێمە کێین و دەمانەوێت چی بکەین.

هەستایە سەر پێ. وتی:

– هێی کوڕە ئەو کتێبەم بدەرێ. تۆ لە گەنجێکی سادە دەچیت. بمدەرێ تەماشایەکی دەکەم، بزانم کتێبی چۆن دەخوێننەوە. ها چەندە کاغەز دەبەیت بیبە. من کتێبەکە دەخوێنمەوە و، بۆت دەهێنمەوە.

کتێبەکەم بەجێهێشت، کاغەزەکانم هەڵگرت و گەڕامەوە بۆ قاوشەکە. کە ڕووداوەکەم بۆ هاوڕێکانم باس کرد، سەریان سوڕما، وتیان: ئیشەڵا هیچ گرژییەك ڕوونادات، دەستیان کرد بە دۆعا کردن.

بەرەبەیان لەگەڵ (ئادەمیزادە دڕەندە)کەدا چاومان بە یەکتر کەوت. دەمەو ئێوارەش هات بۆ قاوشەکەمان. کاتێ کە هاتە ناو

قاوشەکەوە هەموو بەندکراوەکان هەستانە سەر پێ، ئەو چووە جێگا ئامادەکراوەکەوە. تەنانەت فزەیە لە کەسەوە نەدەهات.

هاواری کرد. خاوەنی ئەم کتێبە لە کوێیە؟

وتم: لێرەم.

- ها کتێبەکەت بگرە. کتیبێکی دیکەت لایە؟

وتم: بەڵێ.

- مادام وایە بمدەرێ .

پەیامی (ڕابەری گەنجان و حەشر)م پێدا. لە دەستی وەرگرتم، بێ ئەوەی باس لە هیچ شتێك بکات گەڕایەوە، ڕۆیشت.

وتم: هیچ نەبێ چاییەکمان بخۆرەوە.

بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە وەڵامی دایەوە:

- کاتێکی تر...

بەنکراوەکانی قاوشەکە هەناسەیەکی قووڵیان هەڵکێشا، چونکە ئەوە یەکەمین جار بوو کە بەبێ دروستکردنی ئاژاوە لە قاوش بچێتە دەرەوە .

بە تێپەڕبوونی کات هاوڕێیەتیمان لەگەڵ (ئادەمیزادە دڕەندە)کە باشتر دەبوو. هەموو ڕۆژێك چەند کاتژمێرێك بەیەکەوە بووین. یان خۆی دەهاتە قاوشەکەمان و پرسیاری دەربارەی ئەو بابەتانە دەکرد کە لە کتێبەکاندا خوێندبوونییەوە و لێیان تێنەگەیشتبوو، یان منی

بانگ دەکرد بۆ حانووتەکە و چەند کاتژمێریك کتێبمان دەخوێندەوە و گفتوگۆمان دەکرد .

ژیانی لەناو خوێنرێژی و شەڕو ئاژاوەدا بەسەربردبوو. باوەڕ و ئیمانی لە دەستدابوو. دڵی ئەوەندە ڕەق بوویوو خەفەتی بەهیچ نەدەخوارد.

بەڵام جارێکی تر بە خوێندنەوەی (پەیامەکانی نوور)و ئاشنابوون بە بابەتەکانی ژیانی بەندایەتی و زیندووبوونەوەی دوای مردن و لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی ئاهی بەبەردا هاتەوەو، سەرسام و شادمان بوو.

زۆر حەزی لە ئایین و ئەو بابەتانە دەکرد کە پەیوەندییان بە ئایینەوە هەبوو. زۆر زیرەك و خێرا لە بابەتەکان تێدەگەیشت .

لەماوەی (١٠) ڕۆژدا گۆڕانکارییەکی بەرچاوی بەسەردا هات. بەڕێوەبەری کارگێڕی بەندیخانەکە لە هەموومان شادومانتر بوو.

ئەو بەڕێوەبەرەی کە هاوڕێیەتییەکەی منی لەگەڵ (پیاوە دڕندەکە) بیستبوو، هات بۆ قاوشەکەمان. وتی:

– خودا لێتان ڕازی بێت، ئەم پیاوە هەموو ڕۆژێك کارەساتی دەقەوماند. ئێستا تەواو ئارام بووەتەوە. چیتان کردووە وا ئەم پیاوەتان بێ دەنگ کردووە؟

منیش (پەیامەکانی نوور)م نیشانداو وتم:

- بە تەنها ئەمانەمان خوێندۆتەوە، کە باس لە ئامانج و ئەرکەکانی مرۆڤ و بوونی ڕۆژی لێپرسینەوە دەکات، هەر ئەوەندە... ئەمە بەسە بۆ ئەو.

بەڕێوەبەر بە سەرسامییەوە وتی:

- ئای خوایە ! ناتوانم تێبگەم. ئایا ئێوە ئەم کتێبانە دەخوێننەوە، وەك بڵێی ئاژاوەگێڕی و کارەسات ناهێڵن، بەندکراوەکانیش بە خوێندنەوەی ئەم کتێبانە واز لە خراپەکاری دەهێنن و ڕزگاریان دەبێت. نازانم ئایا نیگەران ببم، یان دڵخۆش ببم؟(ئادەمیزادە دڕندە)کە لە کۆتاییدا ئەو بڕیارەی دا کە هەمووومان چاوەڕێمان دەکرد، وتبوی:

- ئیتر منیش دەمەوێت نوێژ بکەم. فێری نوێژ کردنم بکەن.

چەند ڕۆژێکمان مابوو بۆ ئازاد کردنمان کە دەستی کرد بە نوێژ کردن. بەندیخانەکە مزگەوتێکی بچووکی هەبوو. ڕۆژێك درەنگ وەخت چووم بۆ مزگەوتەکە، مستەفای برامان لە سوجدەدا بوو، سەری لە سوجدە دانابوو، بەکوڵ دەگریا. ئەو دیمەنەی زۆر کاری تێکردم.

ئەوەندەی کە دەنگی لێوە دەردەهات هاواری دەکردو دەیوت:

- خوایە گیان بمبوورە، هەزار جار پەشیمانم لەو هەڵانەی ئەنجامم داون.

چوومە لای. بانگم کرد:

– کاك مستەفا.

سەری لە سوجدە بەرز کردەوە. چاوەکانی تەواو سوور بووبوون، فرمێسك ڕووخساری تەڕ کردبوو.

باوەشی پیا کردم. وتی:

– دۆغانی برام، تاوانم یەکجار زۆرە، چی بکەم بۆ ئەوەی خودا لەم تاوانانەم خۆشبێت؟بەڵێ (ئادەمیزادە دڕندەکە)، پیاو کوژە بەدناوەکەی بەندیخانە، ئەو مرۆڤە خوێنڕێژە، ماڵ وێرانکەر و بێ بەزەییە سەری لە سوجدەدا دانابوو وەك منداڵێك دەپاڕایەوە.

ئەم یادەوەرییەی کە لە (کاك دۆغان)ەوە گوێبیستی بووم زۆر کاری تێکردم. بێگومان تەنها ڕێگە بۆ ئەوەی مرۆڤەکان ببنە کەسانی چاکەخوازو تێگەیشتوو لەکۆمەڵگادا، پێویستە بەرچاوڕوون بن بەرامبەر بەوەی کە بۆچی دەژین و، بۆ کوێ دەچن و، چۆن لێپرسینەوەمان لەتەکدا دەکرێت.

ئەوەتا (ئادەمیزادە دڕندەکە) چیتر دڕندە نییە، هاوڕێیەکی گیانی بە گیانییە، موسوڵمانێکی جوامێر و دڵسۆزە، بووەتە کەسێکی کامڵ و سەرڕاست.

ئەم چیرۆکە زۆر وانەی بەسوود فێری کۆمەڵگا و بەڕێوەبەرانی کۆمەڵگا دەکات.

**خالید ئێرتوغروڵ**

# دوو مرۆڤی

# فریشته ئاسا

له ئیستەنبوڵ بە بۆنەی مانگی ڕەمەزانەوە بانگهێشت کرابووم بۆ پێشانگایەکی کتێب.

بە تەماشاکردنی ئەو گەنجە خوێن گەرمانەی لە دەورم کۆبووبوونەوە زۆر خۆشحاڵ بووم، لە ڕووخساری بێگەردو هەڵسوکەوتی دڵسۆزانەیاندا داهاتووی گەشاوەی ئیمان و وڵاتم دەبینی.

بە دڵنیاییەوە ئێمە گوێگری قسە خۆشەکانیان نین، ئەوەی لە بەسەرهاتەکانیاندا دەیانخوێننەوە (ڕاستییەکانی ئیمان)ن.

لە نێوان خوێنەرەکانماندا ژن و مێردێك سەرنجمیان ڕاکێشا. ماوەیەکی زۆر لە مێشکم دەرنەچوون. تێگەیشتم لەوەی کە دەیانەوێت بابەتێکی زۆر گرنگم پێ بڵێن.

لەو قەرەباڵغییەدا بواری یەکترناسین نەبوو. لەبەر ئەوەی کاتی بەریانگ نزیك بووبووەوە پێویست بوو بەرنامەکە تەواو بکەین. ئەو هاوڕێیانەی پێشانگەکەیان ڕێکخستبوو دەیانویست بمانبەن بۆ نان خواردن. هەر چۆنێك بێت ئەو ژن و مێردەش پێداگرییان دەکرد قسەم لەگەڵ بکەن. جگە لەوەش لەبەرئەوەی لەدوای بەریانگ لە شوێنێکی دیکەش بەرنامە هەبوو، پێویست بوو پێشانگای کتێبخانەی سوڵتان ئەحمەد بەجێ بهێڵین‌و بچین بۆ حەرەم.

هەرچەندە زۆر بوارم نەبوو بڕیارمان دا لەگەڵ ئەو ژن و مێردەدا تا حەرەم بەیەکەوە بڕۆین. لەم میانەیەدا بە پێوە بەریانگیشمان دەکردەوە.

بەڵێ، ئەو دوو گەنجە ... تازە هاوسەرگیرییان ئەنجام دابوو، ئەو دوو کەسە خاوێنە... زۆر کاریان تێکردم وەکو ڕۆحێك وابوون لە دوو جەستەدا، یەك تێگەیشتن لە دوو دڵدا، یەك بیرکردنەوە لە دوو مێشکدا و یەك ئامانج لە دوو ناخدا.

لەدڵی خۆمدا دەموت: خوایە گیان! باشترین دوو مرۆڤی دونیا چۆن بەیەك گەیشتوون... ئەمە بەخشینێکی زۆر گەورەو جوانە.

هەموو ساتێکی ژیانیان پڕ بوو لە خزمەتی ئیمان... نەخشەی ڕۆژەکانیان کێشابوو، لەپێناو بڵاوکردنەوەی ناوی خودا تێدەکۆشان، هەڵپەیان بوو بۆ باسکردنی (ڕاستیەکانی ئیمان) بۆ ئەو

گەنجانەی کە پێویستیان پێی بوو. نموونەی دڵسۆزیی‌و هەوڵدان بوون، عاشقی خزمەتکردنی ئیمان و قورئان بوون..

ئەو ژن و مێردەی کە دەیانویست وەڵامی پرسیارگەلێك لە من وەربگرن، هەستیان بەوە نەکردبوو کە من چەندە سوودم لەوان وەرگرتووە.

بەسەرهاتی ژیانیان هێندە کاریگەر بوو کە نەمتوانی بەرگەبگرم، پێنووسەکەم دەرهێناو دەستم کرد بە نووسینی تێبینی.

بەتایبەتی ئەو خەونە سەیرانەی کە ئەو خانمە لاوە باسی لێوە دەکردن.

کچەکەمانم ڕازی کرد ئەگەر هیچ نەبێت بەشێکی ئەو خەونانەم بۆ بنووسێت و بۆم بنێرێت، بەڵێنم پێدان کە ناوەکانیان نەنووسم.

کچەکەمان سەلامەت بێت بەڵێنەکەی بەجێهێنا و بەشێکی ئەو خەونە سەرسوڕهێنەرانەی نووسی و بۆی ناردم. منیش دەمەوێت بەشێکی ئەو خەونانە بۆ خوێنەرە بەڕێزەکانم بگێڕمەوە.

مامۆستای بەڕێزم، پێشتر بەڵێنم پێدابوویت نامەت بۆ بنووسم. وتم ئێستا کاتییەتی و دەستم پێکرد. هیوادارم لە هەڵەکانم ببووریت.

من لە ڕیزە لە دایکبووم، پاشان لە ئیستەنبوڵ نیشتەجێ بووین. ناڕەحەتی زۆرمان چەشت. ماڵەکەمان زۆر بچوك بوو. هەندێ لە

خزمەکانیشمان لای ئێمە دەمانەوە. باوکم زۆر توورەبوو بەڵام زۆریش بەبەزەیی بوو. دایکم لە ماڵەکەدا کۆڵەکەی ئارامگری بوو.

لە ماڵەوە هەمیشە فشاری خوشکەگەورەیەتیم لەسەر بوو. هەرچەندە هێشتا منداڵێکی هەڵەشە بووم، بەردەوام دەگریام، نەمدەتوانی لە ڕووداوەکان تێبگەم. بە زۆر لەچکم کردبوو. زۆر پێی بێزار دەبووم، کە باوکم لە ماڵەوە نەدەبوو لام دەبرد، کە دەهاتەوە خێرا لەچکەکەم دەکردەوە. ئەوکات لە تەمەنی نۆ ساڵیدا بووم. ڕۆژێك کە هەرگیز ناتوانم بیرم بچێتەوە باوکم لە ماڵەوە نەبوو، منیش ئەو هەلەم قۆستەوە بەبێ سەرپۆش و بەکراسێکی نیو قۆڵەوە چووم بۆ لای هاوڕێکەم. کەچی ئەو ڕۆژە باوکم زوو ڕۆیشتبووەوە بۆ ماڵەوە. منیش بێئاگا لەگەڵ هاوڕێکانم دابوومان بەڕازی قسەدا، زۆرجار هاوڕێکانم لێیان دەپرسیم:

"خوات خۆش دەوێت؟" منیش دەموت: "بەڵێ"، بەڵام لە ناخمدا بە خۆمم دەوت: "بۆچی دەبێت خودامان خوش بوێت"، بەڵام نەمدەتوانی بە ئاشکرا ئەمە بڵێم، چونکە دەموت ئاخۆ چۆن بیرم لێ بکەنەوە. مێشکم شپرزە بووبوو. زۆر بێزاربووم. هەموو ئەمانە منیان لەو ناوەندەدا هێشتبۆوە. منیش چەنەباز بووم. زۆر زۆر قسەم دەکرد. پاشانیش کە دەگەڕامەوە ماڵەوە سەرزەنشت دەکرام.

بەهەرحاڵ، دوای ئەوەی کە تەمەنم گەیشتە ١٥ – ١٦ ساڵی، ئەو کاتە لە دواناوەندی ئیمام خەتیب بووم. خۆشبەختانە گەڕابوومەوە.

ئەم خوێندنگەیە زۆر شتی دەست خستم. ئینجا لەو نێوەندەدا کەناڵی(TGRT) تازە کرابۆوە. هەموو ئێوارەیەك فلیمێکی ئایینی پەخش دەکرد. یەکەم فیلم کە تەماشام کرد، ژیانی بەڕێز (عەزیز مەحمود حودەی) بوو. زۆر کاری تێکردم. دونیایەکی تەواو جیاوازم بینییەوە، بەڵام بەجۆرێك پرسیارەکان هەر لە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون؛ من بۆچی هەم؟ کۆتایم چی دەبێت؟ (حاشا) ئایا خودا بوونی هەیە؟ ئەگەر هەیە چۆن بیناسم؟

دەمویست نوێژ بکەم، بەڵام نەمدەتوانی بزانم بۆچی دەکرێت. نەمدەتوانی لەمەدا سەرکەوتووبم. کەس نەبوو لە دەورم ڕێگام نیشان بدات. داوای چارەم لەوانە دەکرد کە دەهاتنە بەردەمم. دەرمانی دەردم لای کەس نەبوو، لە ئەنجامدا خوای گەورە نیشانەیەکی نیشاندام، وتم با دەست بکەم بە نوێژ. لە ڕاستیدا من هەڵە بووم، چونکە هەموو شتێك ڕوون و ئاشکرا بوو بەڵام من نەمتوانی خۆم بدۆزمەوە. خودا ئەوەندە بەبەزەییە کە هەمدیسانەوە دوعاکەمی قبووڵ کرد.

بەڕاستی نەداری ئەمە بووم. دەمویست پەشیمان ببمەوە و تەوبە بکەم، پاشان بە وتنی با بە دەستنوێژگرتنەوە دەست پێبکەم، چووم بۆ گەرماوەکە. پەنا بە تۆ خوا گیان! چیم بینی، ماڵەکەمان هەڵماوی بوو و زەروو بەسەر دیوارەکانی گەرماوەکەدا ڕۆیشتبوو نیشانەی تیادا جێهێشتبوو، ناوی منی نووسی بوو. ڕاستتر بڵێم

پێیان نووسیبوو. وتم: "لەوانەیە من بە هەڵەدا چوویم". دایکمم بانگ کرد، کە هات وتی:"ئایا هیچ ئیشت نییە ناوت لەسەر دیوارەکە دەنووسیت؟"، وتم:"من نەمنووسیوە". کە درەوشاوەیی نووسینەکەی بینی ئەویش پێکەنی و بێ ئەوەی هیچ شتێك بڵێت بەجێی هێشتم.

خوای پەروەردگار لە کاتی فیترەتدا منی تەنها بەجێ نەهێشت. بە خەونە سەرسوڕهێنەرەکان وەڵامی فرمێسکەکانی دامەوە چەندین جار پێغەمبەری ئازیزمﷺ لە خەونمدا بینی. بەتایبەتی لەیەکێك لە خەونەکاندا شادبوون بە دیداری ئەو زاتە، بوو بە گەورەترین دڵدانەوە بۆ من. لە ساڵی ١٩٩٣ دا خاڵم لە سەربازیدا شەهید بوو. شەوێك قورئانم بۆ ڕۆحی ئەو خوێندبوو. شەهیدبوونی خاڵم زۆر کاری تێکردبووم. لە خەونمدا پێغەمبەرمﷺ بینی، کە ڕووخساری موبارەکی وەکو مانگ دەدرەوشایەوە، بە هەردوو دەستی پیرۆزی دەستەکانی منی گرت و بەرەو ئاسمان بەرزی کردمەوە. دایکی دایکم و باپیریشم کە کوڕەکانیان شەهید بووبوون قاچەکانیان گرتم و هەموو بەیەکەوە بەناو هەورەکاندا دەستمان کرد بە بەرزبوونەوە بۆ سەرەوە. کاتێ سەیری خوارەوەم کرد، لە بۆشایی گەردوون بووین، سەیری دونیام کرد. سەر ئاسمانی ئەورووپا بە تەواوی بە نوور داپۆشرابوو. لەو ڕۆژەوە پشکۆیەك لە ناخمدا دەسوتێت. ئەی خودایە ! وەك ئەوەی بڵێی منی لەنێوان کەسانێکی زۆری

موسـولّماندا بـە ڕابـەر هەڵبـژاردبێت. هەرچـۆنێك بێـت لـە خەونەكـە بەخەبەرهاتم دوای ئەوەی كە چاوەكانم دادەخست هێشتا جوانیی ئەو ڕووخسارە قەشەنگەی بەرامبەرم بوو، بەڵام ترسم لێ نیشتبوو و هەڵدەلەرزیم.

دوای ئەو خەونە بەردەوام لەخوا دەپاڕامەوە كە ئاشنام بكات بەو نوورەو ژیانم ڕووناك بكاتەوە، لەناخەوە دڵنیابووم كە خوای گەورە داواكەم ڕەت ناكاتەوە. ڕۆژانە لەگەڵ هاوڕێكانمدا لە خوێندنگاوە دەچووین بۆ چەند شوێنێك، یەكێكیان سەرنجی ڕاكێشابووم. بە هاوڕێكانم وت چەندە كەسایەتییەكی جیاوازی هەیە. خۆی لەوە پێشتر ئاشنای پەیامەكانی نوور بوو. ئەو بە منی وت: "نوورچی".

وتم: "نوورچی واتای چییە؟" پێی وتم: "بەو كەسانە دەڵێن كە كتێبەكانی حەزرەتی بەدیعوززەمان (سەعیدی نوورسی) دەخوێننەوە". یەكەم جاربوو ئەو ناوە ببیستم. دوای ماوەیەك چووم بۆ پێشانگایەكی كتێب، لەوێ پۆست كارتەكان سەرنجیان ڕاكێشام. لەناویاندا یەكێكیان لەوانی تر جیاواز بوو. ئەمانەی لەسەر نووسرابوو:

"لەكاتێكدا كە گوندێك بێ ئەنجومەن نابێت، دەرزییەك بەبێ وەستا دروست نابێت، پیتێك بەبێ نووسەر نانووسرێت. كەواتە چۆن دەگونجێت كە ئەم دونیا ڕێك و پێكە بێ حاكم بێت".

وتم: ئای ئەو پیاوەی ئەمەی نووسیوە چەندە ژیربووە. ئەوکات نەمزانی کە وتەی مامۆستا نوورسییە، چونکە بە هەڵە ناوێکی دیکەی لەسەر نووسرابوو. ئەو کارتەم کڕی و دام لە دەفتەرەکەم. تەنها زانیاریم دەربارەی پەیامی نوور ئەوەندەبوو.

شەوێك هەستم بە بارێکی مەترسیدار کرد. وەك ئەوەی یەکێك لە تەنیشتمەوە بێت و بەهێواشی بڵێت، خودا بوونی نییە. (حاشا)، هەناسەم تەنگ بوو. نەمدەتوانی هەناسە بدەم، کە من دەموت خودا هەیە، زۆر زیاتر دەنگی بەرز دەکردەوە. هاوارم لە دایکم دەکرد. بۆ ئەوەی بێتە لام و ڕزگارم بکات، چونکە نەمدەتوانی ئەو دەنگە بێ دەنگ بکەم. لەوکاتەدا وتەی سەر ئەو پۆست کارتە گەیشتە فریام. "گوندێك بەبێ ئەنجومەن نابێت..." ئیتر ئەو دەنگە بێ دەنگ بوو. وتم: "خودا هەیە. خودا هەیە و بەرامبەر بەندەکانی زۆر بە بەزەیی و بەخشندەیە"، لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ ڕێگاکانم لەگەڵ پەیامەکانی نووردا یەکیان گرتووە.

بەهۆیانەوە هەموو ئەو گومانانەی لە مێشکمدا هەبوون بەتەواوی ڕەوینەوە، وەڵامی پرسیارەکانم دەستکەوت. ساڵێك پێش هاوسەرگیریم لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەمدا چووم بۆ عەمرە. ئەو چەند ڕۆژە لە کەشێکی ئیمانی و ئارامدا ژیاین و هەستمان بە ئاسوودەییەکی زۆر دەکرد، ئەو عەمرەیە بووبووە بەدیلی تەمەنێکی دووردرێژ.

بە هۆی عەمرەکەوە دایك و باوکم زۆر گۆڕان. لەگەڵ باوکمدا نێوانمان زۆر باش بوو. هەروەها لەگەڵ دایکیشمدا. باوکم پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات بە مامێکمی وتبوو کە لای ئیشی دەکرد "لەگەڵ کچەکەمدا هەست بە دڵخۆشی دەکەم". هەڵبەت باوکم یەك ساڵ و نیو دوای ئەوەی لە عەمرە گەڕاینەوە لە جەژنی قورباندا کاتێ قوربانیی سەردەبڕی کۆچی دوایی کرد. دەست بە دەست نوێژ و ڕووی کردبووە قیبلە، دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردبۆوە، بەهۆی جەڵدەی دڵەوە کۆچی دوایی کردبوو. من ئەوکاتە تازە شووم کردبوو.

زۆرجار لە خەوندا باوکم دەبینم، کە دەیبینم دەڵێم:"باوکە! زۆر بیرت دەکەم. تۆم زۆر خۆش دەوێت. هەر بژیت، نەمردوویت". ئەویش دەڵێت:"گیانەکەم کچەکەی خۆم. منیش بیری تۆ دەکەم. زۆرم خۆش دەوێیت". بەخەبەردێم. تەماشای دەوروبەرم دەکەم. بۆئەوەی باوکم ببینم، بەڵام ئیتر ئەو لێرە نیە. ڕاهاتن بە نەبوونی باوك بۆ من زۆر قورسە، بەڵام هەرکاتێك قورئان دەگرم بە دەستمەوە دەزانم کە یەکتر دەبینینەوە و هەست بە دڵنیایی دەکەم.

مامۆستا گیان، بەڕاستی ئاشنابوون بە قورئان و تێگەیشتن لە واتاکانی لەڕێگەی پەیامەکانی نوورەوە سەرلەنوێ ژیانمی ڕووناك کردەوە، بووە هۆکاری ناسینی نەفسم. هەندێکجار نەفسم زۆرم

لێدەکات بۆ ئەنجامدانی کارێکی هەڵە، دەڵێت: "هەرچۆنێك بێت ئەنجامی بدە". دەڵێم: "نەخێر ناتوانم ئەنجامی بدەم و نایکەم". کاتێك کە نەفسم فەرامۆش دەکەم هەست دەکەم شەیتان خەریکە لەداخا شەق دەبات و خەمبار دەبێت. منیش شایەتمان دەهێنم و هەست بە ئاسوودەیی دەکەم.

بەڵام کاتێ خۆراکی واتایی وەرناگرم شەیتان دەیەوێت تۆڵە بسەنێتەوە. ئەم جارەش پێی دەڵێم کە ئایا من ئەوەندە بێ مێشکم خۆم  بە تۆوە خەریك بکەم. تۆ دەسپێرم بە خودای پەروەردگار. چاوەڕوانی یارمەتی لەخوا دەکەم.

مامۆستا گیان، هەستم بەوە کردووە مرۆڤ یان خۆی خۆی پەروەردە دەکات یان خوای گەورە چاودێری دەکات، ئێمەی مرۆڤ لە ژیاندا پێویستمان بە زانست و کردەوەیە، بەڵام لە پێش هەموویانەوە زۆر پێویستمان بە پاکێتی و دڵسۆزییە.

"اللّهم اجعلنا من عبادك المخلصين" آمين

دوعام بۆ بکەن. بە خواتان دەسپێرم.

٢٦ کانونی دووەم ٢٠٠١

**خوشك و خوێنەرتان لە ئیستەنبوڵەوە**

# بێزاربووم لە فرمێسکەکان

من لە ئێسکی شەهر خوێندکاری زانکۆی ئەنادۆڵم لە کۆلێژی پەروەردە دەخوێنم، خوێندکاری پۆلی سێهەمم .

یەکەمجار ئێوەم لەڕێگەی خوێندنەوەی کتێبەکەتانەوە بەناوی (خۆمم دۆزییەوە) ناسی. ئەم کتێبە دیاری برا گەورەکەم بوو بۆ من. کتێبەکەتان زۆر کاری تێکردم. چەند بەشێکی کتێبەکەم بەدەم گریانەوە خوێندەوە، بەپێی ئەوەی کە ئەم کتێبە ئەوەندە کاریگەری هەبوو لەسەرم، وتم ئاخۆ کتێبی (ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگەڕێت) چەندە کاریگەر بێت؟!

چەند مانگێکە ئەم پرسیارە لە مێشکمدا دێت و دەچێت. لەکۆتاییدا ئەمڕۆ کتێبەکەتانم کڕی بە ناوی (ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگەڕێت)، پاشانیش کتێبی (ژیانێکی نوێ)م کڕی. دڵنیام کاکیشم بەم نیازەوە کتێبی (خۆمم دۆزییەوە)ی پێشکەش کردم.

نزیکەی دوو هەفتەیە لە ئێسکی شەهرم. لێرە لە بەشی ناوخۆیی دەمێنمەوە، هێشتا بە تەواوی دەستم بە خوێندنی وانەکان نەکردووە، هەست بە بێزاری دەکەم. دوو ساڵ پێش ئێستا کە هاتم بۆ ئێرە بەهۆی هەستکردنم بەتەنهایی دەستم کرد بە نوێژ کردن، بەڵام نەمتوانی بە رێك و پێکی ئەنجامی بدەم.

ئەم هاوینە وازم لە نوێژ کردن هێنا و هێشتا نەمتوانیوە دەست پێبکەمەوە. لەبارودۆخێکی خراپدا بووم.

زۆر بێزارو شپرزە بووم، چوومە جێگای نووستنەوە. لە ژوورەکەمدا تەنها بووم. کتێبی(ژیانێکی نوێ)م گرت بە دەستمەوە و دەستمکرد بە خوێندنەوەی. هێشتا لە یەکەم بەشدا بووم کە باس لە (محەمەدی دوزجەیی) دەکەن، خۆم بۆ ڕانەگیراو دەستم کرد بە گریان، زۆر خەمبار بووم، بیرم لە ئەزموونی خۆم کردەوە.

لە ڕاستیشدا ڕۆژانی تاڵ و ناخۆشم تێپەڕاند. سەرەڕای ئەوەی ئاگاداری ئەرکە بەندایەتییەکانم بووم، بەڵام بەجێم نەدەگەیاندن، نەمدەتوانی بیانکەم. لەلایەك لە خۆم توورەبووم و هەستم بە شەرمەزاری دەکرد، لەلایەکیش دڵخۆش بووم بەوەی کە دەمتوانی لەناخەوە بگریم بۆ ئەوەی کەمێك ئاسوودە ببم.

کێ دەزانێت لەوانەشە پاش ماوەیەکی کورت هەمدیسان بتوانم شادیی واتایی بدۆزمەوەو دەست بە ژیانێکی نوێ بکەم.

تكایه لـه کـەموکورپیم ببـورن مامۆسـتا گیـان، کـەمێك بابەتەکـەم شێواند، پاش خوێندنەوەی بەشی یەکەمی کتێبەکـە و پـاش کـەمێك گریان ئەوە هات بە مێشکمدا کە ئەم نامەیەتان بۆ بنووسم.

نامەوێت زیاتر درێژە بە قسەکانم بدەم.

مامۆستا گیان دەمەوێت زۆر سوپاسـت بکـەم و دەسـتخۆشـیت لێ بکەم کەوا کتێبی ئاوهـا جـوان و کاریگـەر دەنووسـیت، لەبەرئـەوەی ئـەو ڕاسـتیانەی ئێمـە نەماندەویسـت ببینـین تـۆ نیشـانت دایـن. داواکاریم لە خودا ئەوەیە کە بەردەوامیت پێ ببەخشێت لە نووسینی ئەم کتێبـە سـوودبەخش و ناوازانـەدا و، ئێمـەش سـوودمەندبین لـە زانیاری و ئەزموونە فراوانەکەت. بەهیوای بەردەوامی بەختـەوەریی و سەرکەوتنتان.

ڕێزم هەیە بۆتان.

**نەزمییە گیوزێل**

# دەستم کرد بە نوێژکردن



مامۆستا گیان، ئەمە دووەم نامەیە بۆتان دەنووسم. ڕەنگە نەتوانن ئەم نامەیەتان لەنێوان دەیان نامەی خوێنەران و خۆشەویستاندا بیربکەوێتەوە. بەم هۆیەوە دەمەوێت لە پێشدا خۆم بناسێنم.

ناوم (نەزمییە گیوزێل)ە. خوێندکارم لە ئێسکی شەهر. لە یەکەم نامەدا ویستوومە باسی بارودۆخی ڕۆحی خۆمتان بۆ بکەم بۆئەوەی یارمەتیم بدەن تا ئاسوودەیی واتایی بەدەست بهێنم.

ئەمڕۆ کە هاتمەوە بۆ بەشی ناوخۆیی هاوڕێکەم کتێبێکی ئێوەی پێدام زۆر سەرسام بووم. کە کتێبەکەم کردەوە و ناوەکەتانم بینی زۆر دڵخۆش بووم. نامەکەتان لە نێو کتێبەکەدا زۆر کاریگەر بوو. هەوڵدەدەم ڕاسپاردەکانتان جێبەجێ بکەم. سەرلەنوێ ئەم ئێوارەیە

دەستم کردەوە بە نوێژ کردن، ناخم پڕبوو لە ئاسوودەیی. لە نزیکترین هەلدا کتێبەکانی دیکەشتان بەدەست دەخەم.

لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکانمدا کتێب و نامەکانتان دەخوێنمەوە. بڕوا بکەن ئەوانیش بە هێندەی من تامەزرۆی بینینی ئێوەن. لە دڵەوە دەمەوێت لەگەڵ ئێوەدا یەکتر بناسین و، بگەم بە خزمەتت، دەمەوێت لە دەرفەتێکدا سەردانتان بکەم، هیوادارم پەسەندی بکەن.

مامۆستا گیان، ئەگەر ڕووداوەکانی ژیانم هەمووی بنووسم پەڕەکان پڕ دەبنەوە، بەڵام نامەوێت زیاتر درێژە بەقەسەکانم بدەم، نامەوێت بێزارتان بکەم، کاتە بەنرخەکانتان بە هەدەر بدەم. ناوەڕۆکی وتەکەم ئەوەیە کە دەمەوێت لەڕێگەی ئەم نامەیەوە سوپاست بکەم. سوپاسی خوای پەروەردگار دەکەم کە کەسێکی ڕێزداری وەك ئێوەی بەخشیوە بە ئێمە وەك ڕێگا نیشاندەرمان. ڕێز و سڵاومت پێشکەش دەکەم، بە ڕێزەوە دەستەکانت ماچ دەکەم.

خودا ئاگادارتان بێت.

**نەزمییە گیوزێل**

# ناخم ئاسوودەیە



لە دایکبووی ساڵی (١٩٨٠) ی (ئادانا) م. ناوم سێڤدایە. لە زانکۆی غازی کرشەهر، لە کۆلێژی پەروەردە خوێندکاری پۆلی یەکەمم.

کاتێك بیستم لە زانکۆ وەرگیراوم، لەلایەك هەستم بە شادمانی دەکردو، لەلایەکی تریشەوە دڵتەنگ بووم. شادمان بووم بەوەی کە دەچم بۆ زانکۆ بۆ خوێندن. هەستیشم بە دڵتەنگی دەکرد کە لە خێزان و خۆشەویستانم دووردەکەوتمەوە و، دەچوومە شارێکی تەواو جیاواز، ناوەندێکی زۆر جیاواز، هاوڕێیانی زۆر جیاواز.

مانگی یەکەم کە هاتم بۆ کرشەهر بەردەوام دەگریام، چونکە نەمدەتوانی لەگەڵ ئەو بارودۆخە تازەیەدا ڕابێم، بیری خێزانەکەم دەکردو ناخم بەخەم داپۆشرابوو. بووبووم بە کچێکی تووڕە و ستەمکار، هیچ شتێك ئاسوودەی نەدەکردم، خۆشیم لە ژیان نەدەبینی. دەمویست بگەم بە ئارامیی و ئاسوودەیی. لە کۆتاییدا

ئەوكاتــە هــات. شــەوێكیان (دیلــەك)ی هــاوڕێم كتێبەكــەی خالیــد ئێرتوغرولی دەخوێندەوە بەناوی (ژیانێكی نوێ). بـە خوێندنـەوەی زۆر خۆشــحاڵ بــوو، زوو زوو لەبــەر خۆیــەوە دەیــوت:"بەڕاســتی كتێبێكی نایابە". هەر كە دیلەك كتێبەكەی تەواو كرد لێم وەرگـرت، لە شوێنی خـۆم هەڵنەسـام، لـە مـاوەی ١ – ٢ كاتـژمێردا كتێبەكـەم خوێندەوە. كتێبەكە ڕووداوگەلێكی پەند ئامێزی تیابوو، زۆر سـوودم لێوەرگرت، هەستم بە شادمانی دەكرد.

١٥ – ٢٠ ڕۆژ بەســەر خوێندنــەوەی كتێبەكــەدا تێپــەڕی. شــەوێك پاش ئەوەی نوێژەكەمم كرد چوومە جێگای نوستنەكەمەوە خـەوتم. ئەو شەوە خەونێكی سـەیرم بینـی، لـە خەونەكەمـدا لەگـەڵ سـەدان كەســدا دەســتمان كــرد بــە گــەڕان بــە شــوێن مــەزاری حــەزرەتی (سەعیدی نوورسی) كـە نـاوی لـەم كتێبـەدا هـاتووە. لـەم ماوەیـەدا بەشێك لەو كەسانەم بینی كە بـە ئاڕاسـتەی هەڵـەدا دەڕۆیشـتن، بـە هاوڕێكانم وت كە ئەوان بهێنینەوە سەر ڕێگاكەی خۆمان.

لــە ئــەنجامی گــەڕانێكی زۆردا مــەزاری حــەزرەتی (ســەعیدی نوورسی)م بینی كە لە ئارامگەیەكدا لـە نـاو تـابوتێكی سـەوزدا بـوو. بەســەر تابوتەكــەدا چــەمیمەوە و لــە نــاوی خــاوێنی دیوارەكــەم خواردەوە. (لەگەڵ ئەوەشدا كە لە پێشەوەدا بەلوعـەی لێ بـوو). بـە هاوڕێكانم وت:"لە ئاوی دیوارەكە بخۆنەوە". پاش ئەوەی دوعامان

خوێند چووینە دەرەوە، پێڵاوەکانم ون بووبوو. لە پێی خاتوونێکدا بینیم. دواتر ئەویش ونی کردبوو.

کە بەخەبەرهاتم هەستم بەخۆشی و ئاسوودەییەکی یەکجار زۆر دەکرد ئێستاش هەر بەو شێوەیە...

زانیاری کتێبەکەی خالید ئێرتوغروڵ بە ناوی (ژیانێکی نوێ) و کتێبەکانی دیکەیم بە هاوڕێکانم ڕاگەیاند، ئەوانیش خوێندیانەوەو سوودمەند بوون. زۆر سوپاسی مامۆستام خالید ئێرتوغروڵ دەکەم و دوعای بۆ دەکەم.

**سێڤدا تۆك گۆز**

# کتێبی (محەمەدی دوزجەیی)

# وەربگێڕنە سەر زمانی ئەڵمانی



مامۆستای بەڕێزمان:

پاش خوێندنەوەی کتێبەکەتان بە ناوی (محەمەدی دوزجەیی) بڕیارماندا ئەم نامەیەتان بۆ بنووسین. ئێمە دوو کچی گەنجی تەمەن ١٤ و ١٥ ساڵین، لە شاری کرەفێڵد دەژین.

هەرچەندە لە وڵاتێکی گاور دەژین، هیچ کات نوێنەرایەتی کردنی دینیی ئیسلامی خۆمان لە بیر نەکردووەو، ئیشەڵا لە بیریشی ناکەین. بەڵام پێویستە لەگەڵ بەرەو پێشچوونی کات ئێمەش بەرەوپێش بچین و زانیاری نوێ بەدەست بهێنین. ئەوەش لە ڕێگای کتێبەوە دەبێت. کتێبی (محەمەدی دوزجەیی) زۆر یارمەتیدەرمان بوو لەم ڕێگایەدا.

ئێمە لێرە لەڕێگەی خوێندنەوەی کتێبەکەتانەوە بە پرسیارەکانی (محەمەدی دوزجەیی) خوالێخۆشبووی برامان و وەڵامەکانی ئێوەی

بەرێز ئاشنابووین و سوودێکی زۆرمان لێوەرگرت و فێربووین بەشێوازێکی جوان و شیاو وەڵامی کەسانی دەوروبەرمان بدەینەوە، بەڵام لێرەدا دەمانەوێت بپرسین:"ئایا ناتوانن ئەم کتێبە، واتە (محەمەدی دوزجەیی) وەربگێڕنە سەر زمانی ئەڵمانی؟" چاوەڕوانی وەڵام دەکەین بۆ ئەم پرسیارەمان.

لەبەر ئەوەی کە نامانەوێت زیاتر درێژە بە نامەکەمان بدەین، داوای لێبووردن دەکەین بۆ ئەوەی کە نووسیومانە و دەستەکانت ماچ دەکەین.

هەڵبەتە چاوەڕوانی دوعاکانیشتان دەکەین.

لەگەڵ ڕێزماندا.

**کوبرا کاشکچی و ئامینە ئالکان**

# پێرست

# UÇURUMDAN DÖNÜŞ

## HALİT ERTUĞRUL

ئەم پەرتوکە چەند چیرۆکێکی ڕاستەقینەو بەسەرهاتی زیندوی هەست هەژێنی لەخۆ گرتووە.
ئەم چیرۆکانە، پڕن لە ناسۆریی و کێشەی دەروونی ئەو مرۆڤانەی کە دواجار هەتوانی برینەکانیان دەستدەکەوێت.

لەم بەرهەمەدا پرسیارە پەنگ خواردووەکانی ویژدان و ئەشکە ڕژێنراوەکان و خەمە قووڵەکانی ناو دەروون، بە گەڕانەوەی هەمیشەیی سارێژ دەبن.

بۆ نرخاندنی ژیانتان و ڕێکخستن و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانتان، خۆتان بدەنە دەست ئەم بەسەرهاتە زیندووانە. ئاسوودەیی نەچێژراوی گەڕانەوەی ڕاستەقینە هەست پێ دەکەن، تاقی بکەنەوە..




ISBN 127-000-000-4




ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا
ARA Media Center
ara.m@hotmail.com



نرخی (٣٥٠٠) دینارە